# مافی بڕیاردانی

# چارەنووس

## لە بەڵگەنامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکاندا

ئامادەکردن و وەرگێڕانی
ئەبوبەکر سالّح ئیسماعیل





دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **مافی بڕیاردانی چارەنووس**
- ئامادەکردن و وەرگێڕانی: ئەبوبەکر ساڵح ئیسماعیل
- پیتچنین و نەخشەسازی بەرگ و ناوەوە: مراد بەهرامیان
- ژمارەی سپاردن: ٨٤١
- چاپی یەکەم: ٢٠١٢
- تیراژ: ١٠٠٠
- نرخ: ٢٠٠٠ دینار
- زنجیرەی کتێب: ٦٧٦
- چاپ: چاپخانەی موکریانی - هەولێر



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ● پێڕستی بابەتەکان

لاپەڕە

# پەیماننامەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە مافە شارستانی و سیاسییەکان بە پێی بڕیاری کۆمەڵەی گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان ژمارە ٢٢٠٠ئەلف (د– ٢١) لە مێژووی ١٦ی کانوونی دووەمی ١٩٦٦

## دێباچە

دەوڵەتانی پەیوەندیدار لەم پەیماننامەیەدا وایدەبینن کە ئیقرار کردن بە کەرامەتی رەسەن و مافە یەکسان و جێگیرەکان بۆ یەکەیەکەی ئەندامانی خێزانی مرۆڤایەتی، بەگوێرەی ئەو پرەنسیپانە کە لە پەیماننامەی نەتەوەیەکگرتووەکاندا راگەیەنراوە، بناغەی ئازادی و دادپەروەری و ئاشتی لە جیهاندا پێکدەهێنێ و ئیقرار دەکا کەئەم مافانە لەناخی کەرامەتی ڕەسەنی مرۆڤەوە هەڵقولاون و پەی بەوە دەبا کەتاکە ڕێگا بۆ هێنانەدی نموونەی هەرەباڵا، بەگوێرەی جاڕنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ، لەوەدایە کە مرۆڤەکان ئازادبن، لەمافە شارستانی و سیاسییەکان بەهرەمەند بن و لەترس و هەژاری ڕزگار بن، ئەمەش ڕێگای فەراهەم کردنی هەلومەرجێکە کە توانابە هەموو مرۆڤێک دەبەخشێ تالە مافە شارستانی و مافە ئابووری کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکان بەهرەمەند بێت و بە پێی پەیماننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان بە چاوی بایەخ و نرخزانییەوە دەڕوانێتە ئەرکی دەوڵەتان لە پابەندبوونیان لە بە هێزکردنی ریزگرتن و ڕەچاوکردنی جیهانییانەی ئازادی و مافەکانی مرۆڤ، هەروەها پەی بەوە دەبا کە تاکەکەس، کە کۆمەڵە ئەرکێکی لەبەرامبەر کەسانیتر و ئەو کۆمەڵەیەشدا دەکەوێتە سەرشان کە ئینتیمای بۆ دەکا بەرپرسیاریی ئەوەی لەسەرە کە هەوڵبدات ئەو مافە دانپێدانراوانەی نێو ئەم پەیماننامەیە پتەو و ڕەچاو بکا، جا لەسەر ئەم مادانەی خوارەوە رێککەوتن:

# بەشی یەکەم

## ماددەی ١

١- هەموو گەلان مافی بڕیاردانی چارەنووسی خۆیان هەیە.بەپێی ئەو مافەش هەرگەلێک ئازادە لەبڕیاردان لەســەر ناوەندی سیاسی خۆی و ئــازادە لە هەوڵدان بۆ هێنانەدی گەشــەکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووری خۆی.

٢- هەموو گەلێــک دەتوانێ بۆ هێنانەدی ئامانجە تایبەتییەکانی خۆی، ئازادانە ڕەفتار لەگەڵ سامان و داهاتە سروشتییەکانی خۆی بــکا، بێ ئەوەی تێکدانێــک بخاتەناو هیــچ کام لەپابەندییەکانی کەلەهاوکاریــی نێودەوڵەتیــی ئابووریــەوە هاتوونەو لەســەر پرەنسیپی بەرژەوەندی هاوبەش و قانوونی نێودەوڵەتی دامەزراون. لەهیچ حاڵەتێکدا ناشێت هیچ گەلێک لە هۆکارەکانی ژیانی تایبەتی خۆی بێبەش بکرێ.

٣- دەوڵەتانــی پەیوەندیــدار لــەم پەیماننامەیــەدا وێــرا بەو دەوڵەتانەشــەوە کە بەرپرســیارییەتی بەڕێوەبردنــی هەرێمە بێ ئۆتۆنۆمییــەکان و هەرێمەکانی نێو (وصایە) یان بە ئەســتۆوەیە، لەســەریانە کــە کار بۆ هێنانــەدی مافی بڕیاردانــی چارەنووس بکەن و ڕێزی ئەو مافە بگرن بــە گوێرەی حوکمەکانی پەیماننامەی نەتەوەیەکگرتووەکان.

# بەشی دووەم

## ماددەی ٢

١- هەموو دەوڵەتێک کەلە نێو ئەم پەیماننامەیەدایە لەسەریەتی کە ڕێزی ئەو مافە دانپێدانراوانە بگرێ و دەستەبەریی ئەم مافانە بۆ ئەو کەسانە بکا کەلە هەرێمەکەی ئەودان یاخوود لەژێر فەرمانڕەوایی ئەودان، بێ هیچ جۆرە جیاکردنەوەیەک بە هۆی نەژاد، یان ڕەنگ، یان ڕەگەز، یان زمان، یان ئایین، ڕای سیاسی یان ناسیاسی، یان بنەماو بنەڕەتی نەتەوەیی یان کۆمەڵایەتی، یان سامان، ڕەگ وڕەچەڵەک یاخوود شتی تری جیا لەم هۆیانە.

٢- هەر دەوڵەتێکی کە لەم پەیماننامەیەدایە، ئەگەر هات و ڕێ و شوێنی یاسایی یان نایاسایی کارپێکراو، بەکردەوە زامنی بەکارهێنانی ئەم مافە دانپێدانراوانە نەکا کە لەم پەیماننامەیەدا هاتووە، ئەوا پەیمان دەدا کە بەپێی ئیجرائاتی دەستووری خۆی و حوکمەکانی ئەم پەیمانە، کاری پێویست لە ڕێ و شوێنی یاسایی و نایاسایی بۆ مەبەستی بەکارهێنانی ئەم مافانە، ئەنجام بدا:

٣- هەر دەوڵەتێک کە لەم پەیماننامەیەدایە، پەیماندەدات کە:

(ا) : زامنی دابین کردنی ڕێگایەکی کاریگەر بۆ هەر کەسێک بکا کە بە پێی ئەم پەیماننامەیە مافەکانی یان ئازادییەکانی پێشێل کرابێ، تەنانەت ئەگەر ئەو پێشێلکارییە لە لایەن کەسانێکیشەوە ئەنجام درابێ کە سیفەتێکی ڕەسمیشیان هەبێ.

(ب) : زامنی هەر کەسێک بکا کە بەم جۆرە ستەمی لێکرابێ، دەسەڵاتێکی دادوەریی یان کارگێڕیی یان قانوونیی تایبەت، یان هەر دەسەڵاتێکی تایبەتی تر، کە لە سیستەمی قانوونیی دەوڵەتدا هاتووە، لێکۆڵینەوە لە بارەی مافەکانی بکا.هەروەها توانا و

دەرەتانەکانی سکاڵای دادوەریی پەرە پێبدات.

(ج) : زامنی دەســـەڵاتە تایبەتییەکان بکا کە هەڵسن بە جێبەجێ کردنی ئەو حوکمانەی کە لە بەرژەوەندی ستەم لێکراوان، دەرچووە.

### ماددەی ٣

دەوڵەتانـــی نێو ئـــەم پەیماننامەیـــە، پەیمـــان دەدەن کە زامنی یەکسانبوونی پیاوان و ژنان دەکەن لەمافی بەهرەمەند بوون لە هەموو مافە شارســـتانیی و سیاســـییەکان کە لە دەقی ئەم پەیماننامەیەدا هاتووە.

### ماددەی ٤

١- لەحالەتی وەزع و پێشهاتە ئاوارتەکاندا کە هەڕەشە لە ژیانی نەتەوە دەکا و ئەم حاڵەتەش بە شێوەیەکی رەسمیی راگەیەنرا بێ، دەوڵەتانـــی نێو ئەم پەیماننامەیە، بۆیان هەیە لە بەرتەســـکترین ســـنووردا، کە وەزعە کە داخوازیی دەکا، کۆمەڵە رێ و شـــوێنێک بگرنە بەر کە بەپابەندییەکانی نایانبەســـتێتەوە بەڵام بە مەرجێک ئەو رێ و شـــوێنانە، ئەوپابەندییانەی دیکە نەسڕێتەوە کە بەپێی قانوونی نێو دەوڵەتیی دەکەوێتە ســـەری و هـــەڵاواردن (تمیز) یێک نەگرێتە خۆی کە پاســـاوەکەی تەنیا نەژاد، رەنگ، رەگەز، زمان، ئایین و بنەمای کۆمەڵایەتی بێ.

٢- ئەم دەقە رێگا بە هیچ سەرپێچییەک لە حوکمەکانی ماددەکانی ٦، ٧، ٨، (هەردوو بڕگەی ١، ٢) ١١، ١٥، ١٦، ١٨ نادات.

٣- هـــەر دەوڵەتێک کە لـــەم پەیماننامەیە دایـــە و مافی پابەند نەبوونی بە کارهێناوە، دەبێ دەسبەجێ، لە رێگای ئەمینداری گشتیی نەتەوە یەکگرتـــووەکان، دەوڵەتانی دیکەی نێو ئەم پەیماننامەیە، لەبارەی ئەو حوکمانەوە کە پێیەوە پابەند نەبووە و ئەم هۆکارانەش

ڕابگەیەنێ کە بۆ ئەمە پاڵی پێوەناوە، ئاگادار بکاتەوە هەروەها لە سـەریەتی ئەو مێژووەش کە پابەندنەبوونەکەی تێدا کۆتایی دێ، جارێکی دیکە و هەر لە هەمان ڕێگەوە ڕابگەیەنێ.

### ماددەی ٥

١- ئەم پەیماننامەیە هیچ حوکمێکی ئەوتۆی تێدانیە کە شـیاوی ئەوەی هەبێت بە جۆرێک لێک بدرێتەوە کە بەبارێکدا سـوودی لێ وەربگیرێ کە ماف بداتە هیچ دەوڵەتێک یان گرووپێک یان کەسـێک بۆ دەسـت بەکاربوون یـان چالاکییەک یان هەسـتان بەکارێک کە ئامانجـی بەفیڕۆدانی هیچ کام لەو مـاف و ئازادییانە بێ کە لەم پەیماننامەیەدایـە یان دانانی کۆمەڵە کۆتێک کـە فراوانترن وەک لەوەی کە لە دەقی پەیماننامەکەدا هاتووە.

٢- لەهیچ وڵاتێک سـەپاندنی هیچ کۆتێک یان هیچ بەرتەسـک کردنەوەیەک لە مافـە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ کە دانی پێدانراوە یان پەیڕەو کراوە، شیانی قەبوڵ کردنی نییە بەبیانووی ئەوەی کە دانی بەو پەیماننامەیەدا نەناوە یاخوود لە بەرتەسـکترین مەودادا دانی پێداناوە.

## بەشی سێیەم

### ماددەی ٦

١- مافی ژیـان مافێکە یاوەری خوودی هەمـوو مرۆڤێکە و دەبێ قانوون ئـەم مافە بپارێزێ و ناشـێ هیچ مرۆڤێک بەشـێوەیەکی هەڕەمەکی لەژیان بێبەش بکرێ.

٢- لەو وڵاتانەدا کە سزای لە سێدارەدان هەڵنەوەشاوەتەوە حوکم بەم سـزایە ناکرێ تەنیا لەحاڵەتی تاوانگەلێکی یەکجار ترسناک

دا نەبــێ بەپێی قانوونــی پەیڕەوکراو لە ســەروبەندی ڕووداونی تاوانەکە، کە لەگەڵ حوکمەکانی ئەم پەیماننامەیە و ڕێککەوتننامەی بەربەستکردن و سزادانی تاوانی کۆمەڵ کوژیدا ناڵێک نییە. هەروەها ناشێ ئەم سزایە جێبەجێ بکرێ تەنیا بەپێی حوکمێکی کۆتایی نەبێ کەلە دادگایەکی تایبەتییەوە دەرچوو بێ.

٣- لەوکاتــەدا کە بێبەش کــردن لە ژیان، دەبێتــە تاوانێک لە تاوانەکانی کۆمەڵ کوژی، ئەوا بەشــێوەیەکی بەڵگەنەویســت دیار و ڕوون دەبــێ کە لــەم مادەیەدا هیچ دەقێکــی تێدانییە کە ڕێگا بە هیچ دەوڵەتێک بدات کە لەم پیماننامەیەدایە، بە هیچ شــێوەیەک خۆی لەو پابەندییانە ببوێرێ کە بەپێی حوکمەکانی ڕێککەوتننامەی بەربەست کردن و سزادانی تاوانی کۆمەڵ کوژی، دەکەوێتە سەری.

٤- هەرکەسێک بەسزای لە سێدارەدان حوکم دراوە مافی داواکردنی لێبوردنی تایبەتی یان گۆڕینی سزاکەی هەیە.لە هەموو حاڵەتێکیشدا بەخشــینی لێبوردنی گشــتی یان تایبەتی یان گۆڕینی ســزای لە سێدارەدان، کارێکی شیاوە.

٥- حوکمی ســزای لە ســێدارەدان بۆ ئــەو تاوانانە دەرناچێ کە کەسانێک لە خوار تەمەنی هەژدە ساڵی ئەنجامیان داوە و هەروەها ئەم حوکمە بەسەر ئافرەتی دووگیاندا جێبەجێ ناکرێ.

٦- ئــەم ماددەیە هیچ حوکمێکی تێــدا نییە کە بیانوو بۆ خۆلادان سەبارەت بە دواخستن یان بەربەست کردنی هەڵوەشاندنەوەی سزای لە ســێدارەدان لە لایەن هیچ دەوڵەتێک کە لەم پەیماننامەیە دایە، بڕەخسێنێ.

## ماددەی ٧

نابێ هیچ کەسێک بخرێتە بن باری ئەشکەنجە یان ڕەفتار و سزای سەخت، یان نامرۆڤانە یان کەرامەتی لێبدرێ.و بەجۆرێکی تایبەتی

نابێ هیچ تاقیکردنەوەیەکی پزیشــکی یان زانســتی، بەســەر هیچ کەسێکدا جێبەجێ کرێ بەبێ ڕەزامەندی ئازادانەی خۆی.

## ماددەی ٨

١- نابێ هیچ کەسێک بەکۆیلە بکرێ.کۆیلەتی و بازرگانیی کردنی کۆیلە بە هەموو شێوەکانییەوە قەدەغەیە.

٢- نابێ هیچ کەسێک ملکەچی بەندایەتی بکرێ.

٣- (ا) نابێ هیچ کەس بە زۆرەملێ ناچار بکرێ کاری ســوخرەیی یان کاری بە زۆر ئەنجام بدا.

(ب) نابــێ بڕگەی ٣ (ا) بەجۆرێک لێک بدرێتەوە کە لەو وڵاتانەدا کە ڕێگای ســزادان بۆ هەندێک لە تاوانــەکان بە بەندکردن و کاری ســەخت دەدا بەربەســت لە ڕێگای جێبەجێ کردنی سزادان بە کاری سەخت، پێک بهێنێ کە لە دادگایەکی تایبەتی حوکمەکەی دەرچووە.

(ج) بۆ مەبەستی ئەم بڕگەیە، گوزارەی (سوخرەو کاری زۆرەملێ) ئەمانەی خوارەوە ناگرێتەوە:

١- کارەکان و خزمەتگوزارییەکانــی کە لە بڕگەی لقی (ب) ناوی نەهاتووە کە بە عادەت بە سەر کەسێکی دەستگیرکراودا دەسەپێنرێ لە ئەنجامی بڕیارێکی دادوەری یان قانوونی، یان ئەو کەســەی کە بڕیارێکی لەم بابەتەی بۆ دەرچووە و پاشان بە شێوەیەکی مەرجدار ئازاد کراوە.

٢- هەرخزمەتگوزارییەکی کە ســیمایەکی ســەربازیی هەبێ، لەو وڵاتانەش کە دان بە مافی خۆبواردن لە خزمەتی ســەربازی دادەنێ و هەر چەشــنە خزمەتێکی نەتەوەیی کە قانوون بەسەر خۆبوێرانی دادەدا.

٣- هەر چەشــنە خزمەتگوزارییەکی کە لە حاڵەتەکانی نائاسایی یان مەینەتییەکان دا کە هەڕەشــە لە ژیان و خوشگوزەرانی کۆمەڵ دەکا.

٤- هەرچەشــنە کاروبارێک یان خزمەتگوزارییەکی کە پاژێک لە پابەندییە شارستانییە ئاساییەکان پێکدەهێنێ.

## ماددەی ٩

١- هەموو کەســێک مافی ئازادی و ئاسایشــی تاکە کەسیی خۆی هەیە.نابێ هیچ کەســێک بە زۆرەملێ دەستگیر یان بەندبکرێ.نابێ هیچ کەسێک لە ئازادی خۆی بێبەش بکرێ تەنیا بە هۆکارگەلێک کە لە دەقی قانوون دایە و بە پێی رێ و شوێنی پەیڕەوکراو.

٢- هەر کەسێک کە دەسگیر دەکرێ دەبێ لە کاتی دەسگیرکردنەکەیدا هۆکارەکانی ئەم دەســگیرکردنەی پێرابگەیەنرێ.هــەر وەکو دەبێ دەسبەجێ ئەو تۆمەتەی پێڕابگەیەنرێ کە ئاراستەی دەکرێ.

٣- هــەر کەســێک کە بە تۆمەتێک دەســگیر یــان بەند دەکرێ، دەبێ بەخێرایی پێشــکەش بە دادوەرێک یــا فەرمانبەرێک بکرێ کە بە پێی قانوون مۆڵەتی پێدراوە ئەرکی دادوەریی بگێرێ.ئەو کەســە مافی خۆیەتی کە لــە ماوەیەکی مەعقول دا دادگایی بکرێ یان ئازاد بکرێ.دەسبەســەرکردنی ئەو کەســانە، کەچاوەڕێی دادگایی کردن دەکەن، ناشێ رێسایەکی گشتی بێ.بەلام دەشێ ئازادکردنەکەیان بە زەمانەتەوە ببەسترێتەوە تاکو دەستەبەری ئامادەبوونیان لە دادگا دابکرێ لــە هەر قۆناغێک لە قۆناغەکانی رێ شــوێنی دادوەری. هەروەها بۆ دەستەبەرکردنی جێبەجێ بوونی حوکمی دادگا لە کاتی پێویستدا.

٤- هەر کەســێک کە بە دەســگیر کردن یا بەند کــردن لە ئازادی خۆی بێبەش دەبێ، مافی ئەوەی هەیە کە لە دادگا ســکاڵا بکا. تاکو

ئەو دادگایە بێ دواخستن قانوونی بوونی دەسگیر کردنەی یەکلایی بکاتەوە و فەرمانی ئازاد کردنی دەربکا ئەگەر هاتوو دەسگیر کردنەکەی ناقانوونیی بوو.

٥- هەر کەسێک کە بە جۆرێکی ناقانوونیی دەسگیر یان بەندکرا مافی ئەوەی هەیە داوای قەرەبوو کردن بکات.

### ماددەی١٠

١- هەموو ئەوانەی لە ئازادی خۆیان بێبەش بوون، دەبێ رەفتاری مرۆڤانەیان لەگەڵ بکرێ و رێز لە کەرامەتی رەسەنی کەسایەتی مرۆڤ دەگیرێ.

٢- (أ) کەسانی تۆمەتبار لە کەسانی گوناهبار جیادەکرێنەوە، جگە لە هێندێک هەل و مەرجی ئاوارتە.ئەوانەی کە تۆمەتبارن بە جۆرێکی جیا و ئەوتۆ رەفتاریان لەگەڵدا دەکرێ، کە کەسانێکی ناگوناهبارن. (ب) تۆمەتبارانی نەوجەوان لە تۆمەتبارانی پێگەیشتوو جیادەکرێنەوە. و بە زوویی پێشکەش بە دادگا دەکرێن تاکو کێشەکانیان یەکلایی بکرێتەوە.

٣- سیستەمی بەندیخانەکان پێویستە بە جۆرێک ڕەچاوی رەفتارکردن لەگەڵ بەندییەکان دا بکا کە ئامانجی بنەڕەتیی چاکسازیی و دووبارە ئامادەکردنی کۆمەڵایەتیی بەندییەکان بێ. تاوانبارانی نەوجەوان لە تاوانبارانی گەورە جیا دەکرێنەوە و بە جۆرێک رەفتاریان لەگەڵدا دەکرێ کە لەگەڵ تەمەن و پێگەی قانوونیی ئەواندا بگونجێ.

### ماددەی ١١

نابێ هیچ مرۆڤێک بەند بکرێ هەر تەنیا بە هۆی ئەوەی کە ناتوانێ پابەندییەکی گرێبەستیی خۆی جێبەجێ بکا.

## ماددەی ١٢

١- هەر کەسێک کە بە شێوەیەکی قانوونیی لە نێو هەرێمی دەوڵەتێک دایە مافی ئەوەی هەیە بە ئازادیی هاتوو چۆ بکا و بە ئازادی شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆی هەڵبژێرێ.

٢- هەموو کەسێک ئازادە لە چوونە دەرەوە لەهەر وڵاتێک، بە وڵاتەکەی خۆشیەوە.

٣- نابێ ئەم مافانەی کە لە سەرەوە باس کران بە هیچ جۆرە کۆتوبەندێک ببەسترێنەوە، جگە لەوانەی کە لە دەقی قانوون دا هاتووە و ئەم دەقانەش بۆ پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی یان رژێمی گشتی یان تەندروستی گشتی یا دابی گشتی یان ماف و ئازادییەکانی ئەوانیتر پێویستن و هاوڕێکی ئەو مافانە دێنەوە کە لەم پەیماننامەیەدا دانیان پێدانراوە.

٤- نابێ هیچ کەسێک بە زۆرە ملێ لە مافی چوونە ناو وڵاتی خۆی بێبەش بکرێ.

## ماددەی١٣

نابێ بیانییەک کە بە سیفەتێکی قانوونیی لە قەڵەمڕەوی دەوڵەتێکدا کە لەم پەیماننامەیەدایە، نیشتەجێیە دوور بخرێتەوە، تەنیا بە پێی بڕیارێک نەبێ کە بە پێی قانوون وەرگیراوە. ئەمەش دوای ئەوەی کە دەرەتان دەدرێتەوە ئەو بیانییە، لە حاڵێکدا ئەگەر پێچەوانەی پێداویستییەکی ئاسایشی نەتەوەیی نەبێ، کە هۆکارەکانی پشتیوانیکردنی لە دوورنەخرانەوەی خۆی دەخاتە بەر چاو و کێشەکەی لەبەر دەم دەسەڵاتی پەیوەندیدار دەخاتە بەر چاو، یان دەسەڵاتێک کە ئەم دیاری دەکا یاخوود ئەوان بە تایبەت بۆ ئەم کارە دیاری دەکەن یان بە بریکاریی نوێنەرێک کە لە بەرامبەر هەردوو لادا نوێنەرایەتی دەکا.

### ماددەی ١٤

١- هەمــوو خەڵک لە بــەر دەمی دادگادا یەکســانن.مافی هەموو کەسێکە لە کاتی یەکلاکردنەوەی هەر تۆمەتێک کە ئاراستەی دەکرێ یان لە یەکلاییکردنەوەی مافەکان و پابەندییەکانی لە هەر داوایەکی شارستانییدا کێشەکەی بەچاوێکی ویژدانیی سەیربکرێ لە دادگایەکی تایبەت و سەربەخۆ و بێلایەن کە بە پێی قانوون دامەزراوە. هەروەکو دەشــێ کــە رۆژنامەوانیی و جەمــاوەر لە ئامادەبوونــی دادگا لە هەمووی یان بەشــێک لە دادگاییەکە قەدەغە بکرێن بە هۆکاری دابی گشتی یان رژێمی گشــتی یان ئاسایشی نەتەوەیی لە کۆمەڵگایەکی دیموکراتیدا، یاخوود لە بەر پێداویستیی ریزلێنانی ژیانی تایبەتی لایەنەکانی کێشــەکە، یاخوود لە بەر کەمترین سنووریکیش بێ کە دادگا لــەو حاڵەتەدا بە پێویســتی دەبینێ کە لەوانەیە ئاشــکرایی دادگاکە لە هێندێک هەلومەرجی ئاوارتەدا بەرژەوەندی دادپەروەریی بشــێوێنێ، بەڵام دەرچوونی حوکم لە کێشــەیەکی سزایی یاخوود داوایەکی شارستانی ئەوا دەبێ بە شێوەیەکی ئاشکرا دەربچێ، تەنیا لە حاڵەتێکدا نەبێ کە کارەکــە پەیوەندی بە نەوجەوانانەوە هەبێ کــە بەرژەوەندییان وا بخوازێ یان ئەگەر داواکە نالێکیی نێوان دوو هاوســەر بگرێتە خۆی یان پەیوەندی بە چاودێری منداڵەکانیانەوە هەبێ.

٢- مافی هەر کەسێکە کە بە ئەنجامدانی تاوانێک تۆمەتبار کراوە، بــە بێگوناح دابنرێ تا ئــەو کاتەی بە بەپێی قانــوون تاوانەکەی بەسەردا جێگیر دەبێ.

٣- هەر کەسێک کە بە تاوانێک تۆمەتبار کرابێ، لە کاتی دادبینیی کێشــەکەیدا، بە یەکســانییەکی تەواوەوە بە لای کەمەوە مافی ئەم زەماناتانەی هەیە:

أ- دەبێ بە خێرایی و تێروتەسەلی و بە زمانێک کە لێی تێدەگا، جۆری ئەو تۆمەتەی کە ئاراستەی دەکرێ لەگەڵ هۆکارەنیشی، پێڕابگەیەنرێ.

(ب) ڕادەیەکی ئەوتۆی لە کات و ئاسانکاریی بدرێتێ کە بتوانێ خۆی ئامادە بکاو پەیوەندی بە پارێزەرێکەوە بکا کە خۆی هەڵیدەبژێرێ.

(ح) بێ دواکەوتنێکی بێ پاساو، دەبێ دادگایی بکرێ.

(د) دەبێ ڕووبەڕوو دادگایی بکرێ و خۆی بەرگری لە خۆی بکا یاخوود لە ڕێگای پارێزەرەوە کە هەر خۆی هەڵیبژاردووە، (بەرگریی لە خۆی بکا) . ئەگەر هاتوو کەسێک نەبوو بەرگریی لێبکا، دەبێ لەوە ئاگادار بکرێتەوە کە کەسێک هەیە بەرگریی لێدەکا و دەبێ دادگا ئەو حوکمەی پێبدات، لەوەدا کە بەرژەوەندی دادپەروەریی پێویست دەکا، پارێزەرێکی بۆ دابین بکا بێ ئەوەی کرێیەکی بەسەردا بسەپێنێ ئەگەر هاتوو نەیتوانی ئەو کرێیە بدات.

(ە) بتوانێ گفتوگۆ لەگەڵ شایەتەکانی تۆمەتەکەدا بکا، یاخوود کەسێکی تربتوانێ ئەمە بکا، هەروەها ڕەزامەندی بە دەست بێنێ کە ئەویش بە هەمان ئەو مەرجانەی کە شایەتەکانی تۆمەتەکە هاتوون، بتوانێ شایەتی نەفی بانگ بکات.

(د) بە خۆڕایی وەرگێڕێکی بۆ دابین بکرێ ئەگەر هاتوو لەو زمانە کە لە دادگا قسەی پێدەکرێ تێنەگەیشت یان نەیتوانی قسەی پێبکا.

(ز) نابێ زۆری لێبکرێ تا شایەتی لە دژی خۆی بدات یان دان بە گوناهێکدا بنێ.

٤- بۆ نەوجەوانان، ڕێ و شوێنەکان بە جۆرێک لە بەر چاو دەگیرێن کە لەگەڵ تەمەنیاندا گونجاو بێت و لەگەڵ پێداویستی کارکردن بۆ دووبارە ئامادە کردنەوەیان لە بار بێت.

٥- هەر کەسێک کە بە تاوانێک گوناهبار کرا، مافی ئەوەی هەیە بە پێی قانوون پەنا بباتە بەر دادگایەکی بەرزتر بۆ ئەوەی دووبارە

چـاو بە بڕیـــاری گوناهبار کردنەکەی ئەو ســـزایەدا کە پێی حوکم دراوە، بخشێنرێتەوە.

٦- کاتێک کە حوکمێکی کۆتایی بۆ کەسێک دەدرێ کە بە تاوانێک گوناهبـــاری دەکا، پاشـــان ئەو حوکمـــە بەتاڵ کرایـــەوە یاخوود لێبوردنێکی تایبەتی بۆ دەرچوو لە سەر بنەمای پێشهاتێکی نوێ یان کارێکی تازە ئاشـــکرا بوو کە ببێتە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە لەسەر ڕوودانی هەڵەیەکی دادوەری، ئەوا پێویستە ئەو کەسەی لە ئەنجامی ئەو گوناهبار کردنەدا سزا دراوە، بە پێی قانوون قەرەبوو بکرێتەوە، ئەمەش لە حاڵێکدا ئەگەر ســـەلمێنرا کە ئەو کەســـە بەرپرسیارێتی ئەوەی ناکەوێتە سەر شان لە کاتی گونجاودا، چ بە شێوەی پاژەکی و چ بە شـــێوەی هەمەکی، کە ڕووداو یان هەقیقەتی ئاشکرانەبوو، ناکەوێتە ئەستۆی.

## ماددەی ١٥

١- هیچ کەسێک بە هیچ تاوانێک گوناهبار ناکرێ بە هۆی کردنی کارێک یان نەکردنی کارێکەوە کە لە کاتی و سەردەمی خۆیدا بە پێی قانوونی نیشـــتیمانی یان نێودەوڵەتی بە تاوان دانەنراوە. هەروەها ناشێ سزایەکی سەخت تر لەو سزایە بە سەر کەسێکدا بسەپێنرێ کە لە دەمی ڕوودانی تاوانەکـــەدا کارپێکراو بووە. ئەگەر هاتوو، پاش ڕوودانی تاوان دەقی قانوونێک دەرچوو کە ســـزاکەی سووکتر بوو، پێویستە ئەنجامدەری تاوانەکە سوود لەو سووککردنە وەربگرێ.

٢- ئـــەم ماددەیە هیچ شـــتێکی ئەوتۆی تێدا نییـــە کە ببێتە هۆی نەهێشـــتنی دادگایی کردن و سزادانی کەســـێک بە هۆی ئەنجامدانی کارێـــک یان ئەنجام نەدانی کارێک کە لـــە کاتی ڕوودانیدا، بە پێی پڕەنسیپەکانی قانوونی گشتی کە کۆمەڵی نەتەوەکان دانی پێداناوە، بە تاوان دادەنرێ.

## ماددەی ١٦

هەموو مرۆڤێک، لە هەر شـــوێنێک بـــێ مافی ئەوەی هەیە دان بە کەسایەتی قانوونی ویدا بنرێ.

## ماددەی ١٧

١- نابـــێ هیچ کەســـێک بخرێتە ژێـــر بارێکەوە کـــە بە جۆرێکی زۆرەملێ، یان ناقانوونیی موداخەلە لـــە کاروبارە تایبەتییەکانی یان کاروباری خێزانەکەی یـــان ماڵەکەی یان نامەگۆڕینەوەکانی دا بکرێ و نابێ بکەوێتە بەر هیچ پەلامارێکەوە کە شەرەف و سومعەی لەکەدار بکا.

٢- هەموو کەســـێک مافی ئەوەی هەیە کە قانوون لە بەرامبەر ئەم جۆرە موداخەلە کردن و پەلاماردانەدا، بیپارێزێ.

## ماددەی ١٨

١- هەموو کەســـێک مافی ئازادیی بیرو ویـــژدان و ئایینی هەیە. ئەم مافەش ئازادیی لە باوەڕ بە ئاینێک و ئازادیی لە چوونە ســـەر ئاینێک یان باوەڕێک کە خۆی هەڵیدەبژێرێ، ئازادیی لە دەرخستنی ئاینەکەی یان باوەڕەکەی لە پەرستن و بە جێهێنانی رێ و رەسمەکان و پرۆڤـــە کردن و فێرکـــردن، بە تەنیایی یان لەگـــەڵ کۆمەڵە، بە ئاشکرایی یان بە تاکەوە، دەگرێتەوە.

٢- نابێ هیچ کەســـێک بخرێتە ژێر بـــاری حاڵەتێکی زۆرەملێ کە ببێتە هۆی ئەوەی ئازادیی ئەو کەسە لەو ئایینەی کە باوەڕی پێیە، بشـــێوێنێ، یاخوود لە ئازادیی وی لە باوەڕ هێنان بە ئایینێک یان باوەڕێک کە خۆی هەڵیدەبژێرێ بشێوێنێ.

٣- نابێ ئازادیی مرۆڤ پێشـــێل بکرێ لە دەرخســـتنی ئایینی یان

باوەڕکەی، تەنیا بۆ ئەو کۆتوبەندانە نەبێ کە قانوون دەیسە پێنێ و بە کارێکی پێویســت بۆ سەلامەتیی گشــتی یان رژێمی گشتی یان تەندروستیی گشتی یان دابی گشتی یان ماف و ئازادییە بنەڕەتییەکانی ئەوانیتر، دادەنرێ.

٤- دەوڵەتانی ئەم پەیماننامەیە، پەیمان دەدەن کە ڕێزی ئازادیی بــاوکان، یان سەرپەرشــتیاران لە دابین کردنی پــەروەردە کردنی منداڵەکانیان لە رووی ئایینی و ڕەوشتەوە دەگرن بە پێی قەناعەتی تایبەتی خۆیان.

## ماددەی ١٩

١- هەمــوو مرۆڤێک مافی ئەوەی هەیە بیــروڕای خۆی هەبێ بێ ئەوەی تەنگەتاو بکرێ.

٢- هەمــوو مرۆڤێک مافی ئازادیی ڕا دەڕبرینی هەیە. ئەم مافەش ئازادی بەدەســت هێنان و بڵاوکردنەوە گواســتنەوەی بۆ کەسانیتر هەمــوو جۆرە زانیارییەک و بیروڕایەک دەگرێتەوە بێ ڕەچاوکردنی سنوور، جا بە شێوەی نووسراو یا چاپکراو یان لە قاڵبێکی هونەری یان بە هەر ئامرازێکی دیکە کە خۆی هەڵیدەبژێرێ.

٣- پرۆڤەکردنــی ئەو مافانــەی کە لە دەقی بڕگــەی دووی ئەم ماددەیەدا هاتووە، ئەرک و بەرپرسیارێتییەکی تایبەتی بەدوواخۆیدا دەهێنێ، لە بەر ئەوە دەشێ ئەم بڕگەیە ملکەچی هێندێک کۆتوبەند بکرێ بەڵام بە مەرجێک بەدەقێکــی قانوونی دیاری بکرێ و کارێکی پێویستیش بێ:

(أ) : بۆ ڕێزگرتن لە مافەکانی خەڵک یان سوومعەیان بێ.

(ب) : بۆ پارێــزگاری کردن لە ئاسایشــی نەتەوەیی یان رژێمی گشتی یان تەندروستی گشتی یان دابی گشتی بێ.

## ماددەی ٢٠

١– هەر جۆرە پروپاگەندەیەک بۆ جەنگ، بە پێی قانوون قەدەغەیە.
٢– هەر چەشنە بانگەشەیەک بۆ رق و کینەی نەتەوەیی یان نەژاد پەرستی یان ئاینی کە دنەدان بێ بۆ هەڵاواردن یان دوژمنایەتی یان توندوتیژی، بە پێی قانوون قەدەغەیە.

## ماددەی ٢١

١– مافی کۆبوونەوەی ئاشتییانە مافێکی دانپێدانراو دەبێ و ناشێ هیچ کۆتێک بخرێتە سەر پراکتیککردنی ئەم مافە تەنیا ئەو کۆتە نەبێ کەبەپێی قانوون دەسەپێنرێ و کۆمەڵێک رێ و شوێنی پێویست لە کۆمەڵگایەکی دیمووکراسیدا، بۆ پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی یان سەلامەتی گشتی یان رژێمی گشتی یا پاراستنی تەندروستیی گشتی یان پاراستنی مافەکان و ئازادی ئەوانیتر، پێکدەهێنێ.

## ماددەی ٢٢

١– هەرکەسێک مافی ئازادی پێکهێنانی کۆمەڵەی لەگەڵ کەسانیتردا هەیە، لەوانەش مافی دامەزراندنی سەندیکا و پەیوەستبوونی بە سەندیکاوە لە پێناوی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی هەیە.
٢– ناشێ کۆتوبەند بخرێتە سەر پراکتیککردنی ئەم مافە تەنیا بەدەقێکی قانوونیی نەبێ و رێ و شوێنێکی پێویست لە کۆمەڵگایەکی دیمووکراسیدا بۆ، پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی یان سەلامەتیی گشتی یان رژێمی گشتی یان پاراستنی تەندروستیی گشتی یان دابی گشتی یان پاراستنی ماف و ئازادییەکانی کەسانیتر پێکدەهێنێ.ئەم ماددەیە نابێتە بەربەستی ئەوەی کە کەسانی هێزە چەکدارەکان و پیاوانی پۆلیس لە پرۆڤەکردنی ئەم مافە ملکەچی ئەم کۆتبەندە قانوونیە نەبن.

٣- ئــەم ماددەیە هیچ حوکمێکی ئەو تــۆی تێدانییە کە ڕێگا بدات بەدەوڵەتانی ڕێککەوتننامەی ڕێکخراوی نێودەوڵەتیی کار لە ساڵی ١٩٤٨ لەبــارەی ئازادی ســەندیکایی و پاراســتنی مافی ڕێکخراوی ســەندیکایی، کە ڕێ و شــوێنێکی قانوونیی ئەوتــۆ وەربگرن یان قانوونێکی ئەوتۆ جێبەجێ بکەن کەلە سۆنگایی ئەوە، ئەو گرەنتیانە بشێوێنێ کە لە دەقی ئەو ڕێککەوتننامەیەدا هاتووە.

## ماددەی ٢٣

١- خێزان بریتییە لە یەکەیەکی بە کۆمەڵی سروشتی و بنەڕەتیی کۆمەڵــگا، مافی ئەوەی هەیە کە لە پاراســتنی کۆمەڵگا و دەوڵەت بەهرەمەند بێت.

٢- پیاو وژن، هەر لە سەرەتای گەیشتنیان بە تەمەنی هاوسەرگرتن، مافێکی دانپێدانراویان لە هاوسەرگیریی و دامەزراندنی خێزاندا هەیە.

٣- گرێبەســتی هیــچ هاوســەرگیرییەک ئەنجام نــادرێ تەنیا بەڕەزامەندی ئازادانە و تەواو بەدەر لە زۆرە ملێ نەبێ.

٤- دەوڵەتانــی ئــەم پەیماننامەیە، ڕێ و شــوێنی گونجاو بۆ دەســتەبەر کردنی یەکسانیی مافەکان و ئەرکەکانی ژن و مێرد دابین دەکەن لە کاتی هاوســەرگرتن و لە ماوەی هاوســەری و هەروەها لەکاتی هەڵوەشــاندنەوە دا. لە کاتی هەڵوەشانەوەشــدا پێویستە کۆمەڵــە ڕێ و شــوێنێک وەربگیــرێ کە پارێزگاریی پێویســت بۆ منداڵەکان دەستەبەر بکا (لەحاڵەتێکدا کە منداڵیان هەبێ).

## ماددەی ٢٤

١- هەرمنداڵێــک، بــێ هیچ جۆرە هەڵاواردنێک بــە هۆی نەژاد، ڕەنگ، ڕەگەز، زمان، ئایین، بنەمــای نەتەوەیی یا کۆمەڵایەتی،

سامان و ڕەچەڵەک، مافی لەسەر خێزان و کۆمەڵگا و دەوڵەت هەیە تا ڕێ و شوێنی پاراستنی بۆ وەربگیرێ بە هۆی ئەوە کە منداڵە.

٢- هەر منداڵێک کە لە دایک دەبێ، پێویستە دەست بەجێ تۆمار بکرێ و ناوی بۆ دابنرێ.

٣- هەموو منداڵێک مافی هەیە ڕەگەز نامەی هەبێ.

## ماددەی ٢٥

هەموو هاونیشتیمانییەک، بێ هیچ جۆرە ئاوارتەکردنێک لەوانەی کە لە ماددەی ٢ دا هاتووە، ئەم مافانەی هەیە بێ ئەوەی هیچ جۆرە کۆتێکی نامەعقوولی بخرێتە سەر:

(ا) بەشداری لە بەڕێوەبردنی کاروباری گشتیدا بکا، جا چ ڕاستەوخۆ بێ یان لە ڕێگای ئەو نوێنەرانەوە بێ کە بەئازادی هەڵدەبژێردرێن.

(ب) لە هەڵبژاردنە پاک وبێگەردەکاندا بەشێوەی خول (دەورە) و بە دەنگدانی گشتیی و بەشێوەیەکی یەکسانیی لە بەینی دەنگدەراندا و بەڕێگەی دەنگدانی نهێنی بەڕێوەدەچێ زامنی دەربڕینی ئازادانە لە ئیرادەی دەنگدەران بێ، خۆشی هەڵبژێرێ و دەنگیش بدات.

(ج) بەشێوەیەکی یەکسان و هاوشانی هەمووان دەرفەتی ئەوەی بۆ بڕەخسێنرێ کە وەزیفەی گشتی لە وڵاتەکەیدا بەدەست بێنێ.

## ماددەی ٢٦

هەموو خەڵک لەبەردەم قانووندا یەکسانن، بێ هیچ جیاکردنەوەیەک مافێکی یەکسانیان لە پاراستن هەیە. لەمبارەیەوە دەبێ قانوون هەموو جیاکردنەوەیەک قەدەغەبکا و پاراستنی تەواو و کاریگەر لە جیاکردنەوە، جا بەهەر هۆیەکی لە بابەت نەژاد، ڕەنگ، ڕەگەز،

زمان، ئایین، ڕای سیاسی یان ناسیاسی، یان بنەمای نەتەوەیی، کۆمەڵایەتی، سامان یان ڕەچەڵەک، یان هۆکاری تر، بۆ هەموو کەسێک زامن بکا.

### ماددەی ٢٧

لەو دەوڵەتانەدا کە کەمینەی ئەتنیکی یان ئایینی یان زمانەوانی تێدایە، نابێ کەسانی سەر بەو کەمینانە لە مافی بەهرەمەند بوون لە کولتووری تایبەتی خۆیان یا دەربڕینی ئایینی خۆیان و بەرپاکردنی ڕێ و ڕەسم و بەکارهێنانی زمانەکەیان، بە هاوبەشی لەگەڵ ئەندامانی تری کۆمەڵەکەی خۆیان، بێبەش بکرێن.

## بەشی چوارەم

### ماددەی ٢٨

١- کۆمیتەیەک دادەمەزرێ کە بە کۆمیتەی تایبەتی مافەکانی مرۆڤ ناودەبرێ (لێرە بەدواوە لەم پەیماننامەیەدا بە کۆمیتە ناودەبرێ) و ئەم کۆمیتەیە لە هەژدە ئەندام پێکدێ کە ئەم وەزیفانەی کە دەقەکانی لە خوارەوە هاتووە بەجێ دێنێ.

٢- کۆمیتەیەک لە هاوڵاتییانی ئەو دەوڵەتانە پێکدێ کە لەم پەیماننامەیەدان، لەو هاوڵاتیانەی کە خاوەن خەسڵەتی بەرزی ڕەوشتیی و گەواهی بۆ تایبەتمەندییەتی ئەوان لەبواری مافەکانی مرۆڤ دا دراوە، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەوەی کە بەشداریکردنی هەندێک کەسی خاوەن شارەزایی قانوونیی، کارێکی سوودبەخش دەبێ.

٣- دیاری کردنی ئەندامانی کۆمیتەکە بە هەڵبژاردن دەبێ و وەکو کەسایەتی خۆیان کاری تێدا دەکەن.

## ماددەی ٢٩

١- هەڵبژاردنی ئەندامانی کۆمیتە، لە سەر لیستی ئەو کەسانەی کە ئەو لێهاتووییانە یان شارەزاییانەیان تێدایە کە لە ماددەی ٢٨ دا هاتووە، بە دەنگدانی نهێنی بەڕێوەدەچێ و دەوڵەتانی ئەم پەیماننامەیە بۆ ئەم مەبەستە کاندیدی کردوون.

٢- هەر دەوڵەتێکی ئەم پەیماننامەیە بۆی هەیە لە نێو هاونیشتیمانییانی خۆیدا بە لای زۆرەوە تەنیا دووکەس کاندید بکا.

٣- دەگونجێ کەسێک زیاتر لە جارێک کاندید بکرێت.

## ماددەی ٣٠

١- هەڵبژاردنی یەکەم لەوادەیەکدا بەڕێوەدەچێ کە لە شەش مانگ زیاتر لە دەستپێکی جێبەجێکردنی ئەم پەیماننامەیە تێناپەڕێ.

٢- بە لای کەمەوە پێش چوار مانگ لە وادەی هەڵبژاردن بۆ ئەندامێتی کۆمیتە (جگە لە حاڵەتی هەڵبژاردن بۆ پڕکردنەوەی کورسییەکی بەتاڵ کە بە پێی ماددەی ٢٤ ڕادەگەیەنرێ) ئەمینداری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان، نامەیەکی دەستنووس ئاراستەی دەوڵەتانی ئەم پەیماننامەیە دەکا کە تێیدا داوا دەکا کە ناوی کاندیدەکانیان لە ماوەی سێ مانگ دا بۆ ئەندامێتی کۆمیتە پێشکەش بکەن.

٣- ئەمینداری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان لیستی ناوی هەموو کاندیدەکان بە شێوەی زنجیرەیی ئەلف و بێ لەگەڵ ناوی ئەو دەوڵەتەی کە کاندیدی کردووە ڕێکدەخات، ئەم لیستە، بە لای کەمەوە یەک مانگ پێش وادەی هەر هەڵبژاردنێک دەگاتە هەموو دەوڵەتانی نێو ئەم پەیماننامەیە.

٤- ئەندامانی کۆمیتە، بە بانگهێشتی ئەمینداری گشتی

نەتەوەیەکگرتووەکان لە کۆبوونەوەیەکدا کە دەوڵەتانی ئەم پەیماننامەیە پێکدەهێنن، هەڵدەبژێردرێن (نصاب) کۆبوونەوەکە بە ئامادە بوونی دوو لە سێی دەوڵەتانی پەیماننامە تەواو دەبێ و لە هەڵبژاردن بۆ ئەندامێتی کۆمیتە، ئەو کاندیدانە دەردەچن کە زۆرترین دەنگییان هێناوە و زۆرینەی رەهایان لە دەنگی نوێنەرانی دەوڵەتانی پەیماننامە بەدەستهێناوە کە ئامادە بوون و دەنگیان داوە.

### ماددەی ۳۱

١- ناشێ کۆمیتەکە بۆ هەر دەوڵەتێک، لە یەک هاونیشتیمانی زیاتری تێدابێ.

٢- لە هەڵبژاردن بۆ ئەندامێتی کۆمیتە، دادپەروەریی لە دابەشکردنی جوگرافی و نوێنەرایەتی هەموو شارستانێتییەکان و رژێمە سەرەکییە قانوونییەکان، لە بەر چاو دەگیرێ.

### ماددەی ۳۲

١- هەڵبژاردنی ئەندامانی کۆمیتە، بۆ دەورەیەک دەبێ کە ماوەکەی چوار ساڵ دەبێ ئەگەر هاتوو دووبارەش کاندید کرانەوە ئەوا دەگونجێ هەڵبژێردرێنەوە. بەڵام ماوەی ئەندامێتی لەوانەی لە هەڵبژاردنی یەکەمدا هەڵبژێردراون بە تێپەربوونی دوو ساڵ کۆتایی دێت. دیاری کردنی ئەم ۹ ئەندامەش دەستبەجێ بە کۆتایی هاتنی هەڵبژاردنی یەکەم دیاری دەکرێن، ئەمەش لە رێگای سەرۆکی کۆبوونەوە دەبێ کە دەقەکەی لە برگەی ٤ی ماددەی ۳۰یدا هاتووە کە بە رێگەی (قورعە) راکێشان ناوەکەیان دیاری دەکرێن.

٢- لەگەڵ تەواوبوونی دەورەدا، هەڵبژاردنی پێویست بە پێی ماددەکانی پێشووی ئەم پاژە لەم پەیماننامەیە بەرێوە دەچێ.

## ماددەی ٣٣

١- ئەگەر بە گوێرەی کۆدەنگـــی هەموو ئەندامانی تر، یەکێک لە ئەندامان، بـــە هەر هۆکارێکەوە، جگە لەوە کە شـــێوەیەکی کاتیی هەیـــە، لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی خۆی بوارد، ئەوا ســـەرۆکی کۆمیتە ئەمینداری گشـــتی نەتەوەیەکگرتووەکان ئاگادار دەکاتەوە. ئەو کاتەش ئەمینداری گشـــتی نەتەوەیەکگرتووەکان بەتاڵ بوونی کورسی ئەو ئەندامە ڕادەگەیەنێ.

٢- لە حاڵەتی دەســـت لە کار کێشـــانەوە یان، مردنی ئەندامێکی کۆمیتە، ســـەرۆکی کۆمیتە دەســـتبەجێ ئەمینداری گشـــتی نەتەوە یەکگرتووەکان ئاگادار دەکاتەوە و ئەمینداری گشتیش بەتاڵ بوونی کورسی ئەو ئەندامە هەر لە دەسپێکی مێژووی مردنی یان لە مێژووی دەست لە کارکێشانەوەکەی ڕادەگەیەنێ.

## ماددەی ٣٤

١- ئەگەر بەتاڵ بوونی کورسییەک بە پێی ماددەی ٣٣، ڕاگەیەنرا و دەورەی ئەو ئەندامەی کە دەبێ بگۆڕدرێ، لە ماوەی شەش مانگی پـــاش ڕاگەیاندنەکە کۆتایـــی پێ نەیەت، ئەوا ئەمینداری گشـــتیی نەتـــەوە یەکگرتووەکان بە هەر کام لە دەوڵەتانی ئەم پەیماننامەیە ڕادەگەیەنێ کە دەتوانن لە ماوەی دوو مانگدا کاندیدی خۆیان بە پێی ماددەی ٢٩ بۆ پڕکردنەوەی ئەو کورسییە بەتاڵە پێشکەش بکەن.

٢- ئەمینداری گشـــتیی نەتەوەیەکگرتووەکان لیســـتێک لە ناوی هەمـــوو کاندیـــدەکان بە پێی زنجیرەی ئەلـــف و بێیی ڕێکدەخات و لیســـتەکە دەگەیەنێتە دەوڵەتانـــی ئەم پەیماننامەیـــە، ئەو کاتە هەڵبژاردنی پێویســـت بۆ پڕکردنەوەی ئەو کورسییە بەتاڵە بە پێی حوکمە تایبەتییەکانی ئەم پاژەی ئەم پەیماننامەیە بەڕێوەدەچێ.

٣- هەر ئەندامێکی ئەم کۆمیتەیە کە بۆ پڕکردنەوەی کورسییەکی بەتاڵ بە پێی ماددەی ٣٣ هەڵبژێردراوە، ئەرکەکانی ئەندامێتی بەرێوە دەبا تا پاشماوەی دەورەی ئەو ئەندامە تەواو دەبێ کە کورسییەکەی لە کۆمیتەدا بەتاڵ بووە بە گوێرەی حوکمەکانی ئەو ماددەیە.

## ماددەی ٣٥

ئەندامانی کۆمیتە، بە ڕەزامەندی کۆمەڵەی گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان، پاداشتێک وەردەگرن کە لە سەرچاوەی داهاتەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان وەردەگیرێ کە ئەویش بە پێی ئەو مەرجانە دەبێ کە کۆمەڵەی گشتیی بە ڕەچاوکردنی بەرپرسیارێتییەکانی کۆمیتە بە چاوی بایەخەوە، بڕیاری لە سەر دەدا .

## ماددەی ٣٦

ئەمینداری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان هەرچی کە پێویست بێ لە فەرمانبەران و کارئاسانیی، دابینی دەکات تا کۆمیتە بتوانێ بە چالاکییەوە ئەو ئەرکانە راپەڕێنێ کە بە پێی ئەم پەیمانەیە پێی سپێردراوە.

## ماددەی ٣٧

١- ئەمینداری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان هەڵدەستێ بە بانگهێشتی کۆمیتە بۆ بەستنی کۆبوونەوەی یەکەمی لە بارەگای نەتەوەیەکگرتووەکان.
٢- دوای کۆبوونەوەی یەکەم، کۆمیتە لە کاتەکانی خۆیدا هەر وەکو لە رژێمی ناوخۆییدا هاتووە، کۆدەبێتەوە.
٣- کۆمیتە وەک دابی گشتیی کۆبوونەوەکانی خۆی لە بارەگای

نەتەوەیەکگرتووەکان یان لە نووسینگەی نەتەوەیەکگرتووەکان لە ژنێف دەبەستێ.

**ماددەی ٣٨**

هەر ئەندامێک لە ئەندامانی کۆمیتە، پێش ئەوەی لە پۆستەکەیدا دەست بەکار بێ، لە کۆبوونەوەیەکی ئاشکرادا، بە شێوەیەکی رەسمیی بەڵێن دەدا کە بە هەموو پاکێتیی و بێلایەنییەکەوە بە ئەرکەکانی خۆی هەڵبستێ.

**ماددەی ٣٩**

١- ئەندامانی کۆمیتە ئەندامانی خۆی بۆ ماوەی دوو ساڵ هەڵدەبژێرێ و دەگونجێ دووبارە هەڵبژێردرێنەوە.
٢- کۆمیتە خۆی رژێمی ناوخۆی خۆی دادەنێ بەڵام پێویستە ئەم دوو حوکمەی خوارەوە دەستەبەر بکا:
أ- رێژەی (نصاب) بە ئامادەبوونی دوازدە ئەندام تەواو دەبێ.
ب- بڕیارەکانی کۆمیتە بە زۆرینەی دەنگی ئەندامانی ئامادەبوو، وەردەگیرێ.

**ماددەی ٤٠**

دەوڵەتانی ئەم پەیماننامەیە بەڵێن دەدەن کە راپۆرت لە بارەی ئەو رێ و شوێنانە پێشکەش بکەن کە وەریان گرتووە و ئەم رێ و شوێنانەش جێبەجێ کردنی ئەو مافانە دەگرێتەوە کە دانیپێدانراوە و ئەو پێشکەوتنانە دەگرێتەوە کە لە بەهرەمەندبوون لەم مافانە بە دەست هاتوون، ئەمەش:
١- لە ماوەی ساڵێک لە مێژووی دەسپێکی ئەم پەیماننامەیە.
(ب) پاشان هەر کاتێک کە کۆمیتە داوای کرد.

٢- هەمـــوو ڕاپۆرتەکان پێشـــکەش بە ئەمینداری گشـــتی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکرێ کە ئەویش حەواڵەی کۆمیتەی دەکا تاکو ئەو کۆمیتەیە روانینی بۆ بکا. پێویســـتە لـــەم ڕاپۆرتانەدا ئاماژە بەو فاکتەرو بەربەستانە بکرێ کە کاریگەرییان لە سەر جێبەجێ کردنی حوکمەکانی ئەم پەیماننامەیە هەیە.

٣- ئەمینداری گشـــتی نەتەوەیەکگرتـــووەکان، دوای ڕاوێژکردن لەگـــەڵ کۆمیتە، بۆی هەیە، دانەیەک لە هەر پاژێکی ئەم ڕاپۆرتانە بداتە ئاژانســـە پەیوەندیدارەکان کە لەم بـــوارەدا تایبەتمەندییان هەیە.

٤- کۆمیتە توێژینەوە لە ســـەر ئـــەو ڕاپۆرتانە دەکا کە لە لایەن دەوڵەتانی نێو ئەم پەیماننامەیە پێشکەشی کراوە. پێویستە کۆمیتە شـــوێنەواری ئـــەو ڕاپۆرتانە و ئـــەو تێبینیانەی کە لای دروســـت دەبن، بگەیەنێتە ئەو دەوڵەتانـــە. هەروەها کۆمیتە بۆی هەیە، بە وێنەیەک لەو تێبینیانەی خۆی، بە هاوپێچ لەگەڵ ڕاپۆرتەکانی کە لەو دەوڵەتانە پێیگەیشـــتووە، ئـــاگاداری ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی بکاتەوە.

٥- ئەندامانی نێو پەیماننامە بۆیان هەیە باری ســـەرنجی خۆیان لە ســـەر هەر تێبینییەک دەرببڕن کە بە پێی بڕگەی ٤ی ئەم ماددەیە گەڵاڵەکراوە.

## ماددەی ٤١

١- هـــەر دەوڵەتێکی ئەم پەیماننامەیە، بـــە گوێرەی حوکمەکانی ئـــەم ماددەیە، لە هەر کاتێکـــدا بۆی هەیـــە ڕایبگەیەنێ کە دان بە تایبەتمەندیـــی کۆمیتـــەدا دەنێ، لە وەرگرتـــن و توێژینەوەی ئەو بەیاننامانە کە بریتییە لە بانگەشەی دەوڵەتێکی ئەم پەیماننامەیە لەوەی کە دەوڵەتێک لە دەوڵەتانی ئەم پەیماننامەیە، پابەندییەکانی

کـــه ئەم پەیماننامەیە دەیخاتە ســـەری، جێبەجێ ناکا. بە پێی ئەم ماددەیە ناشـــێ ئـــەو بەیاننامانە وەربگیرێـــن و توێژینەوەیان بۆ بکـــرێ، تەنیا ئەگەر لـــە دەوڵەتێکی پەیماننامەکـــە دەرچووبێ کە بەیاننامـــەی دەرکردووە و تێیـــدا دان بـــە تایبەتمەندیی کۆمیتەدا دەنێ. ناشـــێ کۆمیتە هیچ بەیاننامەیەک وەربگرێ کە پەیوەســـتە بە دەوڵەتێکەوە کـــە بەیاننامەی ناوبراوی دەرنەکردووە. ئەم ڕێ و شوێنانەی خوارەوەش بە ســـەر ئەو بەیاننامانەدا دەچەسپێ کە بە گوێرەی حوکمەکانی ئەم ماددەیە وەردەگیرێن:

(أ) ئەگـــەر دەوڵەتـــی پەیماننامـــە بینی دەوڵەتێکـــی دیکەی ئەم پەیماننامەیە لـــە جێبەجێ کردنی حوکمەکانی ئـــەم پەیماننامەیە خۆی دوای دەخا، بۆی هەیە بە بەیاننامەیەکی نووســـراو سەرنجی ئـــەو دەوڵەتە کە لە پەیماننامەدایە، لە بارەی ئەو خۆ دواخســـتنە ڕابکێشـــێ. ئەو دەوڵەتەش کە بەیاننامەی پێگەیشـــتووە، پێویستە لە ســـەری لە ماوەی ســـێ مانـــگ دوای وەرگرتنـــی بەیاننامەکە، شـــیکردنەوەیەک یان بەیاننامەیەک بە نووسراو، بداتە دەست ئەو دەوڵەتە و تێیدا مەســـەلەکە روون بکاتەوە، و هەروەها پێویستە، بە پێی ئەوە کە دەرەتان هەیەو ســـوودبەخش دەبێ، ئاماژەیەکی بۆ ڕێساو ئەو ڕێ و شوێنانە و شێوازی دادبینی ناوچەیی بکا کە بەکار هاتووە یان بەکار دێت یاخوود لەوەی کە تا ئێســـتا لە بەر دەست دایە.

(ب) ئەگەر هاتوو مەســـەلەکە لە ماوەی شەش مانگ لە مێژووی وەرگرتنی بەیاننامەکە، بە شـــێوەیەک یەکلایی نەبووە کە هەردوو دەوڵەتی پەیماننامەکە ڕازی بکا، هەردوو دەوڵەتەکە بۆیان هەیە و مەســـەلەکە حەواڵەی کۆمیتە بکەن لەگەڵ ئاگادارییەک بۆ کۆمیتەو بۆ دەوڵەتەکەی تر.

(ج) ناشـــێ کۆمیتە لەو مەسەلەیە بڕوانێ کە حەواڵەی کراوە، بە

پێی پرەنسیپەکانی قانوونی نێودەوڵەتی کە لە لایەن هەمووانەوە دانیپێدنراوە، تەنیا دوای دڵنیا بوون لەوەی کە بە بەڵگەمەندییەوە هەموو ڕێگاکانی دادبینی ناوچەیی پەنایان بۆ براوەو بێ ئەنجام بووە، ئەم ڕێسایە ئەو حاڵەتانە ناگرێتەوە کە ڕێ و شوێنەکانی دادبینی ماوەگەلێکی ئەوتۆ درێژبخایەنێ کە لە سنووری مەعقوول تێبپەڕێ.

(د) لە کاتی توێژینەوەی ئەو نامانەدا کە لە چوارچێوەی ئەم مادەیەدایە، کۆمیتە کۆبوونەوەی نهێنی دەبەستێ.

(هـ) لە سەر کۆمیتە پێویستە وێرای لە بەر چاو گرتنی حوکمەکانی بڕگەی (ج) بەمەبەستی گەیشتن بە ڕێگاچارەیەکی دۆستانە لە مەسەلەکە لە سەر بنەمای ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و ئەو ئازادییە بنەڕەتییانەی کە لەم پەیماننامەیەدا دانیپێدانراوە، بە هەوڵی ئاشتەوایی لە بەینی ئەو دوو دەوڵەتە هەڵبستێ.

(و) کۆمیتە، لە هەر مەسەلەیەکدا کە بۆی حەواڵە دەکرێ، بۆی هەیە داوا لە هەردوو دەوڵەتی پەیوەندیدار بەو مەسەلەیەوە بکا کە لە بڕگەی (ب) ئاماژەی بۆ کراوە، کە هەموو جۆرە زانیارییەکی گرنگی بدەنێ.

(ز) هەر دوو دەوڵەتی پەیوەندیدار وەکو لە بڕگەی (ب) ئاماژەی بۆ کراوە، مافی ئەوەی هەیە وێنەیەک بۆ کۆمیتە بنێرێ تا لە کاتی بینینی مەسەلەکە نوێنەرایەتی بکا و هەروەها مافی ئەوەی هەیە کە بە زارەکی یان بە نووسراو تێبینی خۆی پێشکەش بکا.

(ح) پێویستە لە سەر کۆمیتە، لە ماوەی دوازدە مانگ لە مێژووی وەرگرتنی ئەو ئاگادارییەی کە لە دەقی بڕگەی (ب) هاتووە، ڕاپۆرتێک پێشکەش بکا:

١- ئەگەر هاتوو گەیشتنە چارەسەرێک کە لەگەڵ مەرجەکانی بڕگەی (هـ) دەگونجێ، ئەوا کۆمیتە ڕاپۆرتی خۆی لە سەر ڕانانێکی

پووختی ڕووداوەکان و ئەو ڕێگا چارەیە کە پێی گەیشـــتوون کورت دەکاتەوە.

٢– ئەگەر هاتوو نەگەیشـــتنە چارەسەرێک کە لەگەڵ مەرجەکانی بڕگـــەی (هـــ) دا دەگونجێ ئـــەوا کۆمیتە، ڕاپۆرتی خۆی لە ســـەر ڕانانێکـــی پووختـــی ڕووداوەکان کـــورت دەکاتەوە و ئـــەو یادنامە نووســـراو و کۆنووسی ئەو بەیاننامە زارەکییانەشی دەخاتە پاڵ کە لە لایەن هەردوو دەوڵەتی پەیوەندیدارەوە پێی گەیشتووە. پێویستە لە هەر مەسەلەیەکیشـــدا، ڕاپۆرتەکە بگەیەنرێتە هەردوو دەوڵەتی پەیوەندیدار بە مەسەلەکە.

٣– حوکمەکانـــی ئـــەم ماددەیە کاتێک جێبەجـــێ دەبن کە دوازدە دەوڵەتی ئەم پەیماننامەیە، هەســـتان بـــە دەرکردنی بەیاننامە لە چوارچێـــوەی بڕگەی (١) ی ئەم ماددەیە. دەوڵەتی ئەم پەیماننامەیە هەڵدەســـتن بە ئەســـپاردنی ئەم بەیاننامانە لای ئەمینداری گشتی نەتەوە یەککگرتـــووەکان، کە ئەویش لە لایـــەن خۆیەوە وێنەی بۆ دەوڵەتانی تری ئەم پەیماننامەیە دەنێرێ. دەوڵەتی پەیماننامە بۆی هەیـــە هەر کاتێک بیەوێ بەیاننامەی خۆی بکێشـــێتەوە ئەمەش بە ناردنی ئاگادارینامەیەک بۆ ئەمینداری گشـــتی. ئەم کێشانەوەیەش شـــێواوییەک ناخاتە بەردەم ڕوانینی لە هەر پرســـێکی کە پێشـــتر بابەتـــی ڕاگەیانراوێک بووە لە چوارچێـــوەی ئەم ماددەیەدا، دوای ئـــەوەش کە ئەمینـــداری گشـــتی، ئاگادارینامەی بۆ کێشـــانەوەی بەیاننامە پێگەیشـــت وەرگرتنی هیـــچ ڕاگەیەنراوێکی نوێ لە هیچ دەوڵەتێکـــی پەیماننامە قبوڵ ناکرێ ئەگەر دەوڵەتی پەیوەندیدار لە نێو پەیمانەدا ڕاگەیەنراوێکی نوێی دەرنەکردبێ.

## ماددەی ٤٢

١- (أ) ئەگەر هاتوو کۆمیتە نەیتوانی بە پێی ماددەی ٤١ چارەسەرێکی رەزامەنـد بۆ هـەردوو دەوڵەتـی پەیوەندیدار لـە پەیماننامەدا، بدۆزێتەوە، ئەوا بۆی هەیە دوای وەرگرتنی رەزامەندی پێش وەختە لە هەردوو دەوڵەتی پەیوەندیدار لە نێو پەیماننامە، کۆمیسیونێکی تایبەتی سازشـکار (کە لێرە بە دواوە بە کۆمیسیون ناوی دەبرێ) پێک بهێنێ کە هەوڵە تەبایی خوازییەکانی لە ژێر ئیختیاری هەردوو دەوڵەتی پەیوەندیداری لاگیری پەیماننامە دابنێ بە ئامانجی گەیشتن بە چارەسـەرێکی دۆستانە بۆ مەسەلەکە لە سەر بنەمای رێزگرتنی حوکمەکانی ئەم پەیماننامەیە.

(ب) کۆمیسـیۆن لـە پێنج کەس پێکـدی کە هـەردوو دەوڵەتی پەیوەندیـداری لاگیـری پەیماننامەکە قبوڵی بکـەن. ئەگەر هاتوو هەردوو دەوڵەتی پەیوەندیداری لاگیری پەیماننامە، نەیانتوانی لە ماوەی سـێ مانگ دا بگەنە رێککەوتنێک لە سەر هەموو یان هێندێک لە پێکهێنانی کۆمیسیۆنەکە، ئەوا کۆمیتە بە رێگای دەنگدانی نهێنی و بە زۆرینەی دوو لە سێ، هەر لە نێو ئەندامانی خۆیدا ئەندامانی کۆمیسیۆنەکە هەڵدەبژێرێ.

٢- ئەندامانی کۆمیسیۆن وەک سیفەتی کەسی خۆیان کار دەکەن. پێویستە ئەو ئەندامانە هاونیشـتیمانی هیچ کام لەو دوو دەوڵەتە یان هیچ دەوڵەتێک نەبن کە لاگیری پەیماننامەنین، یاخوود لاگیری پەیماننامـە بێ بەڵام ئـەو راگەیاندنەی دەرنەکردبـێ کە لە دەقی ماددەی ٤١ دا هاتووە.

٣- کۆمیسـیۆن خۆی سـەرۆکی خۆی هەڵدەبژێـرێ و پەیرەوی ناوخۆی خۆی دادەنێ.

٤- کۆبوونەوەکانـی کۆمیسـیۆن وەک دابی گشـتی لە بارەگای نەتەوەیەکگرتـووەکان یان لە نووسـینگەی نەتەوەیەکگرتووەکان

لە ژنێڤ دەبەستریٚ. بەڵام دەشگونجیٚ لە هەر جێگایەکی دیکەی گونجاودا کە کۆمیسیۆن بە ڕاوێژ لەگەڵ ئەمینداری گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان و هەردوو دەوڵەتی پەیوەندیدار ببەستریٚ.

٥- ئەمینداریێتی گشتی کە لە دەقی ماددەی ٣٦دا هاتووە، خزمەتگوزارییەکانی خۆی، بۆ ئەو کۆمیسیۆنانە بە پێی ئەم ماددەیە دابین دەکا.

٦- ئەو زانیارییانەی کە کۆمیتە وەریگرتووە و کۆی کردۆتەوە، لە ژێر ئیختیاری کۆمیسیۆندا دایدەنیٚ، هەر ئەو کۆمیسیۆنە بۆی هەیە داوا لە هەردوو دەوڵەتی پەیوەندیدار بکا کە لە بارەی بابەتەکەوە زانیاری تری پێبدەن.

٧- کۆمیسیۆن دوای روانینی مەسەلەکە لە هەموو لایەنەکانیەوە، بەڵام بە هەموو حاڵەتێک دەبیٚ لە زەرفی ماوەیەکدا کە لە دوازدە مانگ پاش حەواڵەکرانی مەسەلەکە بۆی، تێنەپەریٚ، راپۆرت پێشکەش بە سەرۆکی کۆمیتە بکا تا ئاگاداری هەردوو دەوڵەتی پەیوەندیدار بکا:

(أ) ئەگەر کۆمیسیۆن نەیتوانی لە ماوەی دوازدە مانگ دا روانینی مەسەلەکە تەواو بکا، ئەوا راپۆرتەکەی ئاماژەیەکی پوخت لە بارەی ئەو قۆناغە دەگرێتە خۆی کە روانین لە مەسەلەکە پێی گەیشتووە.

(ب) و ئەگەر هاتوو گەیشتنە چارەسەرێکی دۆستانە بۆ مەسەلەکە لە سەر بنەمای رێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ کە لەم پەیماننامەیەدا دانییپێدانراوە، ئەوا راپۆرتی کۆمیسیۆن لە رانانێکی پوختی رووداوەکان و ئەو چارەسەرە کورت دەبێتەوە، کە پێی گەیشتوون.

(ج) ئەگەر هاتوو نەگەیشتنە چارەسەرێک کە لە مەرجەکانی برِگەی لقی (ب) دا هاتووە، راپۆرتی کۆمیسیۆن ئەو ئەنجامانە دەگرێتە خۆی کە لە بارەی هەموو پرسە واقعییەکان کە پەیوەندییان بە کێشەکەوە هەیە کە هەردوو دەوڵەت لە سەری نالێکن، لەگەڵ

بیروراکانی خۆی لە بارەی دەرەتانەکانی چارەسەرکردنی مەسەلەکە بە ڕێگاچارەیەکی دۆستانە و هەروەها یادنامە نووسراوەکان و کۆنووسی ئەو تێبینییە زارەکییانە دەگرێتە خۆی کە لە لایەن هەردوو دەوڵەتی پەیوەندیدارەوە پێشکەش کراون.

(د) کە کۆمیسیۆن راپۆرتی خۆی لە چوارچێوەی بڕگەی (ج) دا پێشکەش کرد، هەردوو دەوڵەتی پەیوەندیدار لە ماوەی سێ مانگ لە مێژووی وەرگرتنی ئەم راپۆرتە، هەڵدەستن بە ئاگادارکردنەوەی سەرۆکی کۆمیتە کە ئایا ناوەرۆکی ئەم راپۆرتەی کۆمیسیۆن قبوڵ دەکەن یان نا.

٨- حوکمەکانی ئەم ماددەیە، ئەو بەرپرسیارێتییانە ناشێوێنی کە لە ماددەی ٤١ دا بە کۆمیتە سپێردراون.

٩- هەردوو دەوڵەتی پەیوەندیدار، دانی هەموو خەرجییەکانی ئەندامانی کۆمیتە، بە یەکسانی لە نێوان خۆیاندا دابەش دەکەن لە سەر بنەمای ئەو خەمڵاندنانە کە ئەمینداری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان دایدەنێ.

١٠- ئەمینداری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان دەسەڵاتی هەیە، لە کاتی پێویست دا، خەرجییەکانی ئەندامان بدات بەر لەوەی کە هەردوو دەوڵەتی پەیوەندیدار، خەرجییەکان بدەن، بە پێی بڕگەی ٩ی ئەم ماددەیە.

## ماددەی ٤٣

ئەندامانی کۆمیتەو ئەندامانی کۆمیسیۆنە تایبەتەکانی سازشکار کە بە پێی ماددەی ٤٢ دیاری دەکرێن، هەمان مافی بەهرەمەند بوون لە ئاسانکاریی و ئیمتیاز و پارێزراوییان هەیە کە بە پسپۆرانە بڕیار دراوە کە بە ئەرکەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان هەڵدەستن وەک لە دەقی بڕگەکانی تایبەت بە ڕێککەوتننامەی ئیمتیازەکان و

پارێزراوییەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان دا هاتووە.

### ماددەی ٤٤

ئەو حوکمانەی کە پەیوەندییان بە جێبەجێکردنی ئەم پەیماننامەیەوە هەیە، جێبەجێ دەکرێن بێ ئەوەی شێواندن بخەنە نێو ڕێ و شوێنە بڕیاردراوەکانی لە بواری مافەکانــی مرۆڤ بە پێی بەڵگەنامەکانی دامەزرانــدن و ڕێککەوتننامە تایبەتییەکانــی نەتەوەیەکگرتووەکان و ئاژانســە تایبەتمەندەکان و هەروەها بەربەســت نابێ لە بەردەم دەوڵەتانــی لاگیــری ئــەم پەیماننامەیە کە پەنا ببەنــە بەر ڕێ و شــوێنگەلی دیکە بــۆ یەکلاییکردنەوەی هەر کێشــەو بەرەیەک بە پێی ڕێککەوتننامە گشــتی یان تایبەتییە نێــو دەوڵەتییەکان کە لە نێوانیاندا کاری پێدەکرێ.

### ماددەی ٤٥

کۆمیتە لە ڕێگای ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی، ڕاپۆرتێکی ســاڵانە لە بارەی کارەکانی خۆی پێشــکەش بە کۆمەڵەی گشــتیی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکا.

### ماددەی ٤٦

هیچ لە حوکمەکانی ئــەم پەیماننامەیە نابێ وا لێک بدرێتەوە کە شــێواندن بخاتە بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان و دەســتووری ئاژانســە تایبەتمەندەکان لەو حوکمانەی کە بەرپرسیاریی تایبەتی هــەر کام لە کۆمیســیۆنەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئاژانســە تایبەتمەنــدەکان لە بارەی ئەو پرســانەوە کە ئــەم پەیماننامەیە گرتوویەتیەخۆ.

### ماددەی ٤٧

نابێ هیچ کام لـــە حوکمەکانی ئەم پەیماننامەیە والێک بدرێتەوە کە شێواندن بخاتە مافی رەسەنی هەموو گەلان لە بەهرەمەند بوون و کەڵک وەرگرتنی تەواو لە ســـامان و سەرچاوە سرووشتییەکانی خۆی بەو پەڕی ئازادییەوە.

## پاژی شەشەم

### ماددەی ٤٨

١- ئـــەم پەیماننامەیـــە کراوەیە بۆ ئیمزا کردن لـــە بەردەم هەر دەوڵەتێکـــی ئەنـــدام لـــە نەتەوەیەکگرتووەکان یا ئەنـــدام لە هەر ئاژانسێک لە ئاژانسە تایبەتمەندییەکانی، یا هەر دەوڵەتێکی لاگیر لە پەیڕەوی بنەڕەتی دادگای نێودەوڵەتیی داد، یان هەر دەوڵەتێکی تر کە کۆمەڵەی گشـــتیی نەتەوەیەکگرتـــووەکان داوای لێکردووە کە ببێتە لاگیری ئەم پەیماننامەیە.

٢- ئەم پەیماننامەیـــە ملکەچی پەســـەندکردنە، بەڵگەنامەکانی پەســـەندکردنیش بـــە ئەمینـــداری گشـــتیی نەتەوەیەکگرتووەکان دەسپێردرێن.

٣- هەڵـــی هاتنە پاڵ ئەم پەیماننامەیـــە، بۆ هەر دەوڵەتێک لەو دەوڵەتانـــەی کە لە بڕگەی (١) ی ئەم ماددەیەدا ئاماژەی بۆ کراوە، رەخساوە.

٤- هاتنە پاڵ پەیماننامە لە رێگای ئەسپاردنی بەڵگەنامەی هاتنە پاڵ لای ئەمینداری گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان دەبێت.

٥- ئەمینداری گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان هەموو ئەو دەوڵەتانە ئاگادار دەکاتەوە کە ئەم پەیماننامەیە یان ئیمزا کردووە یا هاتوونە پاڵیەوە، بە ئەســـپاردنی هەر بەڵگەنامەیەک لـــە بەڵگەنامەکانی

پەسەندکردن یان هاتنە پاڵ پەیماننامە.

ماددەی ٤٩

١- جێبەجێ بوونی ئەم پەیماننامەیە، پاش سێ مانگ لە مێژووی ئەسپاردنی سی و پێنجەمین بەڵگەنامەی پەسەندکردن یان هاتنە پاڵ لای ئەمینداری گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان، دەست پێدەکا.

٢- بەڵام ئەو دەوڵەتانەی کە ئەم پەیماننامەیە پەسەند دەکەن یا دەچنە پاڵیەوە پاش ئەوەی کە کاری ئەسپاردنی بەڵگەنامەی سی و پێنجەمینی پەسەند کردنی یان هاتنە پاڵ تەواو دەبێ، ئەوا جێبەجێ کردنی ئەم پەیماننامەیە بۆ هەر یەکێکیان پاش سێ مانگ لە مێژووی سپاردنی بەڵگەنامەی پەسەند کردن یا بەڵگەنامەی هاتنە پاڵ دەسپێدەکا.

ماددەی ٥٠

حوکمەکانی ئەم پەیماننامەیە، بێ هیچ کۆتوبەند و ئاوارتەیەک بە سەر هەموو ئەو یەکانە دا جێبەجێ دەبێ کە دەوڵەتانی فیدراڵییان لێ پێکهاتووە.

ماددەی ٥١

١- هەر دەوڵەتێکی لاگیری ئەم پەیماننامەیە بۆی هەیە پێشنیاری هەموارکردنی پەیماننامە بکا و دەقەکەش لای ئەمینداری گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان هەڵدەگیرێ. لە ئەنجامی ئەمەدا ئەمینداری گشتی هەڵدەستێ بە ئاگادار کردنەوەی دەوڵەتانی لاگیری پەیماننامە لە بارەی هەر هەموارکردنێکی پێشنیارکراو وداوایان لێدەکا کە ئایا ئارەزوودەکەن کۆنگرەیەکی دەوڵەتانی لاگیری پەیماننامە ببەسترێ بۆ روانین لەو پێشنیارانەو دەنگدان لە سەریان یان نا، جا ئەگەر هاتوو بە لای کەمەوە یەک لە سێی دەوڵەتانی لاگیری

پەیماننامە، ئارەزوومەندی بەستنی کۆنگرە بوون، ئەوا ئەمینداری گشـــتی بە چاودێری نەتەوەیەکگرتووەکان کۆنگرەکە دەبەستێ. هەر جۆرە هەموارکردنێک کە زۆرێنـــەی دەوڵەتانی لاگیر کە لە کۆنگرە ئامادەبـــوون و دەنگیـــان داوە دەخرێتە بەردەم کۆمەڵەی گشـــتیی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ بڕیاردان.

٢- جێبەجێکردنـــی هەموارکردنـــەکان کاتێک دەســـت پێدەکا کە کۆمەڵەی گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان بڕیاری لە سەردا و زۆرینەی ئەو دوو لە سێیەی دەوڵەتانی لاگیر لەم پەیماننامەیە بە پێی ڕێ و شوێنە دەستوورییەکانی هەر کامیان قبوڵیان کرد.

٣- هەر کاتێـــک جێبەجێکردنی هەموارکردنەکان دەســـتی پێکرد، ئەوا بۆ دەوڵەتانی لاگیر کە هەموارکردنەکەیان قبوڵ کردووە دەبێتە کارێکی ئیلزامی، دەوڵەتی تریش بە حوکمەکانی ئەم پەیماننامەیەو هەر چەشنە هەموارکردنێکی دیکەی پێشـــوو کە قبووڵیان کردووە، پابەند دەبن.

## ماددەی ٥٢

بـــێ ڕەچاوکردنی ئەو ئاگادارییانەی کە بە پێی بڕگەی ٥ی ماددەی ٤٨ جێبەجێ دەبێ، ئەمینداری گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان هەموو ئەو دەوڵەتانەی کە لە بڕگەی (١) لە ماددەی ناوبراودا ئاماژەیان بۆ کراوە لەمەی خوارەوە ئاگاداریان دەکاتەوە:

(أ) هەمـــوو واژوو، پەســـەند کردن و هاتنە پاڵـــەکان کە بە پێی ماددەی ٤٨ هەڵگیراون.

(ب) مێـــژووی دەســـتپێکی جێبەجێکردنی ئـــەم پەیماننامەیە بە پێی مـــاددەی ٤٩ و مێژووی دەســـتپێکی جێبەجێکردنـــی هەر جۆرە هەموارکردنێک لە چوارچێوەی ماددەی ٥١ دەبێت.

## ماددەی ٥٣

١- ئەم پەیماننامەیە، کە هەموو دەقەکانی بە ئیسپانی و ئینگلیزی و روســـی و چینی و فەرەنسییە، خاوەن بەهایەکی یەکسانن لە نێو بەڵگەخانەی نەتەوەیەکگرتووەکاندا هەڵدەگیرێن.

٢- ئەمینداری گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان وێنەیەکی پەسەندکراو لەم پەیماننامەیە بۆ هەموو ئەو دەوڵەتانە دەنێرێ کە لە ماددەی ٤٨ دا ئاماژەیان پێکراوە.

**جاڕنامە سەبارەت بە مافەکانی کەسانی سەر بە کەمینە نەتەوەیی یان ئەتنیکییەکان و سـەر بە کەمینـە ئایینی و زمانییەکان بە پێی بڕیاری کۆمەڵەی گشـتی نەتەوەیەکگرتـووەکان ژمارە ١٣٥/٤٧ لە مێژووی ١٨ی کانونی یەکەم ١٩٩٢ بەفەرمی کراوەو بڵاوکراوەتەوە.**

کۆمەڵەی گشتی؛

دوبارە جەخت لەوە دەکاتەوە کە یەکێک لە ئامانجە بنەڕەتییەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان هەر وەکو پەیماننامەکە ڕایگەیاندووە، بریتییە لە بەهێزکردنی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان و هاندانی گشـت لایەک بۆ ڕێزلێگرتنی لەلایەن هەموانـەوە بێ جیاوازیدانان بە هۆی نـەژاد یان ڕەگەز یان زمان یان ئاییـن و دووبارە ئیمانی خـۆی بە مافە بنەڕەتییەکانی مـرۆڤ و کەرامەت و بەهای مرۆڤ و مافە یەکسـانەکانی پیاوان و ژنان و گشـت نەتەوەکان بە گەورەو بچووکیانـەوە تەئکید دەکاتـەوەو ئارەزوو دەکا لـە بەهێزکردنی پیادەکردنی ئەو پرەنسیپانەی کە لە پەیماننامەکەدا و جاڕی جیهانی مافەکانـی مـرۆڤ، ڕێککەوتننامەی قەدەغەکردنـی تاوانی قەڵاچۆ کردنی ڕەگەزەکان، ڕێککەوتننامەی لە نێوبردنی هەموو شـێوەکانی جیاوازیی ڕەگەزپەرسـتی، پەیمانی نێودەوڵەتـی تایبەت بە مافە شارستانی و سیاسـییەکان، پەیمانی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە ئابوری و کۆمەڵایەتی و کولتورییەکان، جاڕنامەی پەیوەست بە لە نێوبردنی هەموو شـێوەکانی دەمارگیریی و جیاوازییگەرییی کە لە سـەر بنەمای ئایینی یان بڕوا دامەزراوە، ڕێککەوتننامەی مافەکانی منـداڵ و هەروەها قەباڵەگەلـی دیکەی نێودەوڵەتـی پەیوەندیدار بەمبابەتە کە لە سـەر ئاستی جیهانی و هەرێمایەتی بە فەرمیکراوە و هەروەها ئەوانەش کە بـە تاکەوە لە نێوان دەوڵەتانی ئەندام لە نەتەوەیەکگرتووەکان گرێدراون و بە ئیلهاموەرگرتن لە حوکمەکانی

مـــاددەی ٢٧ لە پەیمانی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە شارســـتانی و سیاسییەکان، کە پەیوەستە بە مافەکانی کەسەکان کە سەر بە کەمینە ئیتنیکـــی یان ئایینی یان زمانییەکانن و وایدەبینێ کە بەهێزکردن و پاراستنی کەسەکان کە سەر بە کەمینە نەتەوەیی یان ئیتنیکییەکانن یان ســـەر بە کەمینـــە ئایینـــی و زمانییەکانن بەشـــداری دەکا لە ســـەقامگیری سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەو دەوڵەتانەدا کە تێیدا دەژین و جەخت لەوە دەکاتەوە کـــە بەهێزکردنی و پیادەکردنی بەردەوامی مافەکانی کەسەکان کە سەر بە کەمینە نەتەوەیی یان ئیتنیکییەکان یان سەر بە کەمینە ئایینی و زمانییەکانن وەکو پاژێکی لە جیابوونەوە نەهاتووی گەشە پێدانی سەرجەم کۆمەڵگا و لە نێو چوارچێوەیەکی دیموکراسیدا کە پشت بە حوکمی قانون دەبەستێ، دەکرێ بەشداری بکەن لە پتەوکردنی دۆستایەتی و هاریکاریی نێوان گەلان و دەوڵەتاندا و وایدەبینێ کـــە نەتەوەیەکگرتووەکان رۆلێکـــی گرنگ دەگێرێ لە پاراستنی کەمینەکان و بە چاوی بایەخپێدانەوە دەڕوانێتە ئەو کارەی کە تا ئێستا لە نێو سیستەمی نەتەوەیەکگرتووەکان دا ئەنجامدراوە، بە تایبەتی لە لایـــەن کۆمیتەی مافەکانی مرۆڤ، کۆمیتەی لاوەکیی بۆ قەدەغەکردنی جیاوازیدانان و پاراســـتنی کەمینەکان و هەیئەتە دامـــەزراوەکان بە پێی هـــەردوو پەیمانی نێودەوڵەتـــی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤ و قەباڵە نێودەوڵەتییەکانی دیکەی پەیوەســـت بە مافەکانـــی مرۆڤ لە بەهێزکردن و پاراســـتنی مافەکانی کەســـەکان کە ســـەر بە کەمینە نەتەوەیی یان ئیتنکییەکان یان سەر بە کەمینە ئایینی یان زمانییەکانن و بـــە چاوی بایەخپێدانەوە دەڕوانێتە ئەو کارە گرنگەی کە رێکخـــراوە حکومییە نێودەوڵەتییەکان و رێکخراوە ناحکومییەکان پێیهەڵدەستن لە پاراستنی کەمینەکان و بەهێزکردنی کەسەکان کە ســـەر بە کەمینە نەتەوەیی یان ئیتنیکییەکان یان سەر بە کەمینـــە ئاینی یان زمانییەکانن و هەروەها پەی بە پێویســـتیی

زامنکردنی هەڵسووڕانی زیاتر دەبا لە هەمبەر جێبەجێکردنی قەباڵە نێودەوڵەتییەکانی مافەکانی مرۆڤ کە پەیوەستن بە مافەکانی کەسەکان کە سەر بە کەمینە نەتەوەیی یان ئیتنیکییەکان یان سەر بە کەمینە ئاینی و زمانییەکانن:

ئەوا ئەم جاڕنامەیە دەربارەی مافەکانی کەسەکان دەردەکا کە سەر بە کەمینە نەتەوەیی یان ئیتنکییەکان یان سەر بە کەمینە ئاینی یان زمانییەکانن.

## ماددەی ١

١- لە سەر دەوڵەتان پێویستە، هەر کامیان لە هەرێمی خۆیدا، کە پارێزگاری لە بوونی کەمینەکان و ناسنامەی نەتەوەیی یان ئیتنیکی و ناسنامەی کولتووری و ئاینی و زمان بکا و هەلومەرجی دەستەبەرکەر بۆ بەهێزکردنی ئەو ناسنامەیە فەراهەم بکا.

٢- دەوڵەتان ڕێوشوێنی قانوونی و هەروەها ڕێوشوێنی گونجاوی دیکەش بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجانە دەردەکەن.

## ماددەی ٢

١- کەسانی سەر بە کەمینە نەتەوەیی یان ئیتنیکییەکان یان کەمینە ئاینی و زمانییەکان

(لەوانەی کە لێرە بە دواوە ئاماژەیان پێدەکرێ کە سەر بە کەمینەکانن) مافی بەهرەمەند بوون لە کولتووری تایبەتی خۆیان هەیە و مافی ڕاگەیاندن و بەجێهێنانی ئایینی تایبەتی خۆیان هەیە و مافی بەکارهێنانی زمانی تایبەتی خۆیان هەیە، جا چ بە نهێنی بێت یان بە ئاشکرا و ئەمەش بە ئازادی و بێ دەستێوەردان بە هەر شێوەیەک لە شێوەکانی جیاوازیدانان.

٢- ئەو کەسانەی کە سەر بە کەمینەکانن مافی ئەوەیان هەیە بە

بەشدارییەکی کردەوەیی لە ژیانی کولتووریی و ئایینی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و گشتیدا بەشداریی بکەن.

٣- کەسانی سەر بە کەمینەکان مافی ئەوەیان هەیە کە بەشدارییەکی چالاکانە لە سەر ئاستی نیشتیمانی، هەروەها لە سەر ئاستی هەرێمایەتی، بە هەر جۆرێک کە گونجاو بێت، لەو بڕیارە تایبەتییانە کە پەیوەستن بە کەمینەکەی خۆیانەوە یان بەو ناوچەیەوە کە ئەوان تێیدا دەژین بە شێوەیەک کە ئەم بەشداریکردنە لەگەڵ قانوونی نیشتمانیدا ناکۆک نەبێت.

٤- کەسانی سەر بە کەمینەکان مافی ئەوەیان هەیە کە رایەڵەی تایبەت بە خۆیان دابمەزرێنن و پارێزگاری لە بەردەوامبوونی بکەن.

٥- کەسانی سەر بە کەمینەکان مافی ئەوەیان هەیە کە پەیوەندی ئازاد و ئاشتییانە لەگەڵ گشت تاکەکانی کۆمەڵی خۆیاندا دابمەزرێنن و هەروەها پارێزگاری لەو پەیوەندییە بکەن، هەروەها مافی ئەوەیان هەیە لەگەڵ کەسانی کەمینەکانی دیکەدا پەیوەندی دابمەزرێنن، هەروەها پەیوەندییان لەگەڵ هاوڵاتییانی وڵاتانی دیکەشدا هەبێت لەوانەی پەیوەندی نەتەوەیی یان ئیتنیکی یان پەیوەندی ئاینی و زمانییان بە یەکەوە هەیە بێ هیچ جۆرە جیاوازیدانانێک.

### ماددەی ٣

١- کەسانی سەر بە کەمینەکان بۆیان هەیە پراکتیکی مافەکانی خۆیان بکەن، بەو مافانەشەوە کە لەم جاڕنامەیەدا هاتوون چ بە سیفەتی تاکەکەسی یان بە هاوبەشی لەگەڵ گشت تاکەکانی کۆمەڵی خۆیان بێ جیاوازیدانان.

٢- نابێ لە ئاکامی پراکتیک کردن یان پراکتیک نەکردنی ئەم مافانە کە لەم جاڕنامەیەدا هاتوون، هیچ زیانێک بە کەسانی سەر بە کەمینەکان بگات.

## ماددەی ٤

١- لە سەر دەوڵەتان پێویستە، هەر کاتێک کە پێویست بوو، ڕێوشوێنی ئەوتۆ پێویست وەربگرن کە دەستەبەر بێ بۆ ئەوەی کەسانی سەر بە کەمینەکان لە گشت مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکانی تایبەت بە خۆیان بەهرەمەند بن و بە شێوەیەکی تەواو و چالاکانە ئەو مافانە بەکار بهێنن بێ جیاوازیدانان و بە یەکسانییەکی تەواو لە بەردەم قانوون دا.

٢- لە سەر دەوڵەتان پێویستە کە ڕێوشوێنی ئەوتۆ وەربگرن کە هەلومەرجی گونجاو فەراهەم بکا کە کەسانی سەر بە کەمینەکان گوزارشت لە تایبەتمەندییەکانی خۆیان بکەن و کولتور و زمان و ئایین و نەریت و دابەکانی خۆیان گەشە پێبدەن، تەنیا لەو حاڵەتانەدا نەبێت کە هێندێک لەو جێبەجێکردنە دیاریکراوانە قانوونی نیشتیمانی پێشێل بکا و لەگەڵ پێوەرە نێودەوڵەتییەکاندا نالێک بێت.

٣- پێویستە لە سەر دەوڵەتان کە ڕێوشوێنی پێویست وەربگرن، هەرکاتێک کە لە توانادا بوو، بۆ ئەوەی کەسانی سەر بە کەمینەکان، دەرفەتی تەواویان بۆ دەستەبەر ببێت کە زمانی دایکیان فێر ببن یاخود بە زمانی دایک بخوێنن.

٤- پێویستە لە سەر دەوڵەتان، هەر کاتێک کە گونجاو بوو، ڕێوشوێنی پێویست لە بواری فێرکردن وەربگرن لە پێناوی پەرەپێدانی زانیاری لە بارەی مێژووی کەمینەکانی ناو وڵاتەکەی و هەروەها دەربارەی نەریت و زمان و کولتوری ئەو کەمینانە. هەروەها کەسانی سەر بە کەمینەکان پێویستە دەرفەتی گونجاویان بۆ بڕەخسێت تا لە بارەی سەرتاپای کۆمەڵگا زانیارییان هەبێ.

٥- پێویستە لە سەر دەوڵەتان کە ڕێوشوێنی پێویست وەرگرن تا دەستەبەری کەسانی سەر بە کەمینەکان بکا کە بەشدارییەکی تەواو

لە پێشکەوتنی ئابوری و گەشەپێدانی وڵاتەکەیان بکەن.

## ماددەی ٥

١- سیاسەت و بەرنامەی نیشـــتیمانی وێرای گرنگیدانی پێویست بە بەرژەوەندە ڕەواکانی کەســـانی سەر بە کەمینەکان نەخشەی بۆ دادەڕێژرێ و جێبەجێ دەکرێ.

٢- پێویستە نەخشـــەدانان و جێبەجێکردنی بەرنامەی هاریکاری و یارمەتی نێودەوڵەتان وێرای گرنگیدانی پێویســـت بە بەرژەوەندە ڕەواکانی کەسانی سەر بە کەمینەکان پیادە بکرێ.

## ماددەی ٦

پێویستە لە سەر دەوڵەتان، لە گشت کاروبارێکدا، لەو پرسانەی کە پەیوەســـتە بە کەسانی سەر بە کەمینەکان، زانیاری و شارەزایی ئاڵوگۆڕ بکەن لە پێناوی بەهێز کردنی لە یەکتریگەیشتن و متمانەی هاوبەش.

## ماددەی ٧

پێویستە لە ســـەر دەوڵەتان کە لە پێناوی بەهێزکردنی ڕێزگرتن لەو مافانەی کە لەم جاڕنامەیەدا هاتوون هاریکاری بکەن.

## ماددەی ٨

١- لە نێو ئەم جاڕنامەیەدا شـــتێک بوونی نیە کەوا لە دەوڵەتان بکا بەرامبەر بـــە پابەندییە نێودەوڵەتییەکانـــی وەفادار نەبێ لەو کاروبارانەی کە پەیوەســـتن بە کەســـانی ســـەر بە کەمینەکان و بە جۆرێکی تایبەتی لە ســـەر دەوڵەتان پێویستە کە بە نیاز پاکییەوە وەفادار بن لـــە بەرامبەر ئەو پابەنـــدی و پەیمانبەندییانە، کە بە

پێی پەیماننامە و ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان کە خۆی لایەنێکە تیایاندا، خستویەتە سەر شانی خۆی.

٢- بە جێهێنانی ئەو مافانەی کە لەم جاڕنامەیەدا هاتوون، نابێتە هۆی بەرهەڵستی لە بەردەم گشت کەسەکان سەبارەت بە بەهرەمەندبوونیان لە مافەکانی مرۆڤ و ئەو ئازادییە بنەڕەتییانەی کە لە سەر ئاستی جیهانی دانیان پێدانراوە.

٣- ئەو ڕێوشوێنانەی کە دەوڵەتان بۆ دەستەبەر کردنی بەهرەمەند بوونێکی تەواو لە مافەکانی نێو ئەم جاڕنامەیە وەریدەگرن، لە رووی پرەنسیپەوە، نابێ وا دابنرێ کە لەگەڵ پرەنسیپی یەکسانیی نێو جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤ نالێکن.

٤- بە هیچ جۆرێک لە جۆرەکان نابێ هیچ پاژێکی ئەم جاڕنامەیە وا لێک بدرێتەوە کە ڕێگە بە هیچ جۆرە چالاکییەک دەدا کە لەگەڵ ئامانجەکان و پرەنسیپەکانی نەتەوەیەکگرتووەکاندا نالێکیی هەیە، ئەمە وێرا بە یەکسانیی لە سەروەریی نێوان دەوڵەتان و پارێزراویی هەرێمایەتی و سەربەخۆیی سیاسیشیانەوە.

## ماددەی ٩

ئاژانسە تایبەتییەکان و گشت دامەزراوەکانی سیستەمی نەتەوە یەکگرتووەکان، هەرکامیان لە بواری تایبەتمەندی خۆیدا، لە پیادەکردنی تەواوی مافەکان و پرەنسیپەکانی نێو ئەم جاڕنامەیە بەشداریی دەکەن.

**جاڕنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ لە نێوبردنی هەموو شێوەکانی ڕەگەز پەرستی بە پێی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ١٩٠٤ (د – ١٨) کە لە مێژووی ٢٠ی تشرینی دووەمی ١٩٦٣ دەرچووە و بڵاوکراوەتەوە .**

کۆمەڵەی گشتی؛

وایدەبینێ کە پەیماننامەی نەتەوەیەکگرتووەکان لە سەر هەردوو پرەنسیپی کەرامەت و یەکسانیی هەموو مرۆڤەکان دامەزراوە و یەکێک لــە ئامانجە بنەڕەتییەکانیشــی کە بانگەوازی بــۆ دەکا هێنانەدی هاوکاری نێودەوڵەتییە بۆ بەهێز کردن و هاندانی ڕێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییــە بنەڕەتییەکانە بۆ تێکــڕای خەڵک بێ جیاوازی دانــان بە هۆی نەژاد یان ڕەگەز یان زمان یان ئایین، وا دەڕوانێ کە جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مــرۆڤ جاڕی ئەوە دەدا کە مرۆڤەکان بە ئازادی لە دایکدەبن و لە کەرامەت و مافەکاندا یەکســانن و مافی هەر مرۆڤێکە کە لە هەموو مافەکان و ئەو ئازادییانە بەهرەمەند بێت کەلەم جاڕنامەیەدا هاتووە بێ هیچ جیاوازیدانانێک جا بە هۆی نەژاد یان ڕەنگ یان بە هۆی ڕەچەڵەکی نەتەوەییەوە بێت و وایدەبینێ کە جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤ جاڕی ئەوە دەدا کە هەمووان لە بەردەم قانون دا یەکسانن و بێ جیاوازیدانان مافی یەکسانیان هەیە لە پاراستن لە هەر چەشــنە جیاوازیی و هەر چەشنە هاندانێک لە بەرامبەر ئەو جیاوازیدانانــە و وایدەبینێ کە نەتەوەیەکگرتووەکان ئیستیعمار و هەموو شێوازەکانی پەراوێز خستن و جیاوازیدانانێکی کــە پێیــەوە بەندن ســەرکۆنە کــردووە و جاڕنامەی بەخشــینی ســەربەخۆیی بە وڵاتــان و گەلانــی کۆلۆنیکراو، بە شــێوەیەکی تایبەتی، پێویستی دانانی سنوورێک بۆ کۆلۆنیالیزم، بە پەلەو بێ هیــچ کۆتوبەندێک، رادەگەیەنێ و وایدەبینێ کە هەر مەزهەبێک کە لە ســەر بنەمای جیاوازیی نانەوەی ڕەگەز پەرستی یان باڵادەستیی

ڕەگەز پەرستی دامەزرابێ لە رووی زانستییەوە هەڵەیە و لە رووی ئەدەبییەوە سەرکۆنەکراوەو لە رووی کۆمەڵایەتییەوەزۆردارانەیە و مەترسیدارە و لە رووی تیۆریی و کردارییەوە هیچ پاساوێک بۆ ڕەگەز پەرستی بوونی نییە و ڕەچاوی ئەو بڕیارانە دەکا کە کۆمەڵەی گشتی وەریگرتووە وێرای ئەو قەباڵە نێودەوڵەتییانەش کە ئاژانسە تایبەتمەندییەکان لە بواری جیاوازیدانان وەریانگرتووە بە تایبەتی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی کار و ڕێکخراوی نێودەوڵەتی بۆ پەروەردە و زانست و کولتوور و رەچاوی ئەوە دەکا کە لەوەی جیاوازیدانان بە هۆی نەژاد یان رەنگ یان رەچەڵەکی نەژادیی لە هێندێک ناوچەی جیهان هێشتا جێگەی نیگەرانییەکی توونده سەرەڕای بەدەستهێنانی هێندێک پێشکەوتن لەم مەیدانەدا لە سەرینی کاری نێودەوڵەتی و کۆششی بە گەڕخراو لە ژمارەیەک وڵاتاندا و هەست بە نیگەرانییەکی توونده دەکا لە هەمبەر شێوەکانی ڕەگەز پەرستی کە هێشتا لە هێندێک ناوچەی جیهاندا دەبینرێ و هێندێکیان لە لایەن هێندێک لە حکومەتەکانەوە لە ڕێگەی کۆمەڵێک ڕێوشوێنی قانوونیی و کارگێریی و هیترەوە سەپێنراون، بە تایبەتی لە شێوەی جیاوازیی ڕەگەزی و پەراوێز خستن و جیاوازینانەوە، هەروەها لە هەمبەر بەهێزبوون و بڵاوبوونەوەی هەردوو مەزهەبی باڵادەستیی ڕەگەزیی و فراوانبوون لە هێندێک ناوچەدا هەست بە نیگەرانی دەکا و لە قەناعەتی خۆیەوە کە جیاوازیی ڕەگەز پەرستی، بە هەموو شێوەکانییەوە، بە تایبەتی سیاسەتگەلی ئەو حکومەتانەی کە لە سەر بنەمای باڵادەستیی ڕەگەزیی یان رق لێبوونەوەی ڕەگەزیی دامەزراوە، لە پاڵ ئەوەدا کە پێشێلکارییەکی بنەڕەتی مافەکانی مرۆڤ، بۆی هەیە پەیوەندی دۆستایەتی نێوان گەلان و هەروەها هاوکاری نێوان نەتەوەکان و ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی بشێوێنێ و هەروەها لە قەناعەتی خۆیەوە کە جیاوازیی ڕەگەز پەرستیی بە تەنیا لە سەر ئەوانە قەتیس

نابێ کە ئازاریان دەدا بەڵکو سەردەکێشـــێتەوە بۆ سەر ئەوانەش کە پیادەی دەکەن و لـــە قەناعەتی خۆیەوە کە بنیاتنانی کۆمەڵگایەکی جیهانی، رزگاربوو لە هەموو شـــێوەکانی پەراوێز خســـتن و ڕەگەز پەرستیی، کە بریتین لەو فاکتەرانەی کە وروژاندنی رق لێبوونەوە و بەش بەشبوون لە نێوان مرۆڤەکاندا دنە دەدەن، یەکێکە لە ئامانجە بنەڕەتییەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان.

١- بە ڕەســـمی تەئکید دەکاتەوە لە پێویســـتیی لە ناوبردنی بە پەلەی ڕەگەز پەرســـتیی لە هەموو گۆشەیەکی جیهاندا، بە هەموو شێوە و رواڵەتەکانییەوە، و پێویستی فەراهەمکردنی تێگەیشتنی لە کەرامەتی کەسی مرۆڤ و ڕێزلێگرتنی.

٢- بە ڕەسمی تەئکید دەکاتەوە لە پێویستیی وەرگرتنی ڕێوشوێنی نەتەوەیی و نێودەوڵەتی پێویســـت لە پێناوی ئەم ئامانجەدا، ئەمە وێـــرا بە فێرکردن و پـــەروەردەو ڕاگەیاندنیشـــەوە، بۆ دابینکردنی پەیبردن و ڕەچاوکردنێکی کردەوەیی لە ســـەر ئاســـتی جیهانی لە هەمبەر ئەم پرەنسیپانەی کە لە خوارەوەدا جێگیرکراون.

٣- و ئینجا ئەم جاڕنامەیە ڕادەگەیەنێ:

مادەی ١

جیاوازیدانـــان لە نێـــوان مرۆڤەکاندا بە هۆی نـــەژاد یان ڕەنگ یان ڕەچەڵەکی نەژادیی ســـووکایەتیکردنە بە کەرامەتی مرۆڤایەتی و پێویســـتە بـــەو پێوانە سەرزەنشـــت بکـــرێ کـــە نکوڵیکردنە لە پرەنســـیپەکانی بەڵگەنامەی نێودەوڵەتی و پێشـــێلکردنی مافەکانی مـــرۆڤ و ئەو ئازادییـــە بنەڕەتییانەیە کە لـــە جاڕنامەی جیهانیی مافەکانـــی مرۆڤدا ڕاگەیەنراون و تەگەرەیەکە لە بەردەم دامەزرادنی پەیوەندیگەلی دۆستایەتی و ئاشـــتی نێوان نەتەوەکان و واقیعێکە بۆی هەیە ئاشتی و ئاسایشی نێوان گەلان بشوێنێ.

## ماددەی ٢

١- بۆ هــەر دەوڵەتێک یان دامەزراوێک یــان کۆمەڵێک یان هەر تاکە کەســێک قەدەغەیە کە لە بواری مافەکانــی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکانــدا، هەر جۆرە جیاوازیدانانێک لە مامەڵەکردن لەگەڵ کەسەکان یان کۆمەڵە کەسانێک یان دامەزراوەێک بە هۆی نەژاد یان رەنگ یان رەچەڵەکی نەژادییەوە بە کاربهێنێ.

٢- بۆ هەر دەوڵەتێک قەدەغەیە کە لە رووی ڕێوشوێنی فەرمییەوە هەڵبستێ بە هاندان و دەســت لە پشتدان یان لایەنگیری هەر جۆرە جیاوازیدانانێــک بکا کە بە هۆی نەژاد یــان رەنگ یان ڕەچەڵەکی نەژادییەوە لە لایەن هەر کۆمەڵێکــەوە یان هەر دامەزراوەیەک یان هەر تاکە کەسێکەوە پەیڕەوبکرێت.

٣- لە هەلومەرجی گونجاودا، ڕێوشوێنی بەرجەستەکراوی تایبەت وەردەگیرێ بۆ دابینکردنی گەشەکردنێکی تەواو یان پاراستنی تەواو بۆ ئەو کەسانەی کە سەر بە کۆمەڵە نەژادییەکانن ئەمەش بە ئامانجی زامنکردنی بەهرەمەندبوونی تەواویان لە مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان، نابێ ئەم ڕێوشــوێنانەش لە هیــچ هەلومەرجێکدا ببێتە هۆی سەرهەڵدانی مافگەلێکی جیاواز یان سەربەخۆ لە هەمبەر کۆمەڵە نەژادییە جیاجیاکاندا.

## ماددەی ٣

١- کۆششی تایبەتی دەخرێتە گەڕ بۆ قەدەغە کردنی جیاوازیدانان بە هــۆی نەژاد یان رەنگ یان رەچەڵەکی نــەژادی، بە تایبەتی لە بوارەکانی مافە شارســتانییەکاندا، هەروەهــا بۆ هاووڵاتیبوون و کاروباری فێرکاریی و ئایینی و کرێکاریی و پیشەو نیشتەجێبوون.

٢- بە شێوەیەکی یەکسان، دەرفەت بۆ هەموو مرۆڤێک دەرەخسێ کە بچێتە ناو هەر جێگاو ناوەندێکەوە کە بۆ هەموو جەماوەر کراوەیە

بێ جیاوازیدانان بە هۆی نەژاد یان رەنگ یان رەچەڵەکی نەژادی.

ماددەی ٤

هەموو دەوڵەتان رێوشوێنی کاریگەر دەگرنەبەر بۆ چاوخشاندنەوە بە سیاسەتەکانی حکومەت و سیاسەتە گشتییەکانی دیکەش بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو قانوون و سیستەمانەی کە دەبێتە هۆی دامەزران و درێژەدان بە جیاوازیی ڕەگەز پەرستیی لە هەر بوارێکدا کەما بێتەوە و پێویستە قانوونی پێویست دەربکات بۆ قەدەغەکردنی ئەم جۆرە جیاوازیدانانە و پێویستە هەموو رێوشوێنێکی پێویست بگرێتەبەر بۆ بەربەرەکانی ئەم جۆرە خولیایەی کە دەبێتە هۆی جیاوازیدانانی ڕەگەز پەرستیی.

ماددەی ٥

دەبێ بێ دواکەوتن کۆتایی بەو سیاسەتانەی حکومەت و هەموو سیاسەتەکانی دیکەش بهێنرێ کە لە سەر بنەمای پەراوێزخستنی ڕەگەزیی دامەزراوە، بە تایبەتی سیاسەتی هەڵاواردنی ڕەگەزیی و هەروەها هەموو شێوەکانی دیکەی جیاوازیدانان و لێکهەڵبڕینی ڕەگەز پەرستیی کە لەم جۆرە سیاسەتانەوە هەڵقوڵاون.

ماددەی ٦

هێچ جۆرە جیاوازیدانانێک بە هۆی نەژاد یان رەنگ یان ڕەچەڵەکی نەژادی قبوڵ ناکرێ لە بەرامبەر بەهرەمەند بوونی هەر کەسێک لە مافە سیاسییەکان و مافەکانی هاووڵاتیبوون لە وڵاتەکەیدا، بە تایبەتی مافی بەشداربوون لە هەڵبژاردنەکان بە شێوەیەکی یەکسان و بەشداربوون لە فەرمانڕەواییدا و هەموو کەسێک بە یەکسانیی مافی وەرگرتنی وەزیفەی هەیە لە ناو وڵاتەکەیدا.

## ماددەی ٧

١- هەموو مرۆڤێک مافی یەکسانی هەیە لە بەردەم قانوون و مافی دادپەروەرییەکی یەکسانی هەیە لە سێبەری قانوون دا. و هەموو مرۆڤێک بێ جیاوازیی بە هۆی نەژاد یان رەنگ یان ڕەچەڵەکی نەژادی، مافی ئاسایشی لە سەر ژیانی خۆی هەیە و هەروەها مافی ئەوەی هەیە کە دەوڵەت لە بەرامبەر هەر تووندوتیژییەک یان ئازارێکی جەستەیی بیپارێزێت جا ئەمە لە لایەن هەر تاکە کەسێک یان کۆمەڵەیەک یان دامەزراوەیەکەوە بێت،

٢- هەر مرۆڤێک مافەکان و ئازادییە بنەڕەتییەکانی رووبەری جیاوازیدانان بە هۆی نەژاد یان رەنگ یان ڕەچەڵەکی نەژادی ببێتەوە مافی ئەوەی هەیە ئەم بێدادییە بەرێتە دادگا تایبەتییە نیشتیمانییە سەربەخۆکان و داوای داد و پاراستنی کردەوەیی بکات.

## ماددەی ٨

دەبێ دەستبەجێ گشت رێوشوێنێکی کردەوەیی پێویست لە بوارەکانی فێرکاریی و پەروەردە و ڕاگەیاندن وەربگیرێ بۆ لە ناوبردنی جیاوازیدانان و سەپاندنی ڕەگەز پەرستیی و هەروەها بەهێزکردنی لەیەکتر گەیشتن و لێبووردەیی و دۆستایەتی نێوان نەتەوەکان و کۆمەڵە نەژادییەکان، هەروەها بۆ بڵاوکردنەوەی ئامانج و پرەنسیپەکانی بەڵگەنامەی نێودەوڵەتیی و جاڕنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ و جاڕنامەی بەخشینی سەربەخۆیی بە وڵاتان و گەلانی کۆلۆنیکراو.

## ماددەی ٩

١- هەموو ئـــەو پروپاگەندە و ڕێکخراوانەی کە لە ســـەر بنەمای بیروباوەڕ و تیورگەلێک دامەزراون و بانگەشـــەی باڵادەســـتیی هەر نەژادێک یان کۆمەڵێک لە ڕەنگێک یان ڕەچەڵەکێکی نەژادی دەکەن بە مەبەستی پاساودان یان بۆ پتەوکردنی هەر شێوەیەک لە شێوەکانی ڕەگەز پەرستیی، بە توونّدی ریسوا دەکرێن.

٢- هـــەر جـــۆرە هاندانێک بـــۆ توونّدوتیژیی و هـــەر کارێک لە کارەکانی توونّدوتیژیـــی کە لە لایەن تاکەکان یان ڕێکخراوەکانەوە دژی هـــەر نەژادێک یان کۆمەڵێک لە ڕەنگێک یان ڕەچەڵەکێکی دیکە ئەنجامبدرێ، بە تـــاوان دژی کۆمەڵگا دادەنـــرێ و بە پێی قانوون سزادانی لە سەرە.

٣- بۆ پیادەکردنی ئامانجەکان و پرەنسیپەکانی ئەم جاڕنامەیە، هەموو دەوڵەتان هەڵدەســـتن بە وەرگرتنی ڕێوشوێنی دەسبەجێ و ئەرێنیی پێویســـت، وێڕا بە ڕێوشوێنی قانوونی و هیدیکەش، بۆ بە دواکەوتنی ئـــەو ڕێکخراوانەی کە بۆ ئەوە دامەزراون جیاوازیدانانی ڕەگەزیـــی بەهێـــز بکەن یـــان هانیبدەن یـــان هانـــی بەکارهێنانی توونّدوتیژیـــی بدەن بۆ مەبەســـتی جیاوازیدانان بە هۆی نەژاد یان ڕەنـــگ یان ڕەچەڵەکـــی نەژادی و جاڕدانی شـــەرعیی نەبوونی ئەم ڕێکخراوانە جا بە بەدواکەوتنیان بێت یاخود بێ بەدواکەوتنیان.

## ماددەی ١٠

نەتەوەیەکگرتـــووەکان و ئاژانســـە تایبەتـــەکان و دەوڵەتان و ڕێکخـــراوە ناحکومییـــەکان ئەو پەڕی توانای خۆیـــان دەخەنە کار بۆ هاندانی ڕێوشـــوێنی کاریگەرانە، کە لەو ڕێگەیەوە ڕێوشـــوێنی قانوونیـــی و ڕێوشـــوێنی کردەوەیـــی دیکـــەش پێکـــەوە، دەرفەت بڕەخسێنێ بۆ هەڵوەشاندنەوەی جیاوازیی ڕەگەز پەرستیی بە هەموو شـــێوەکانییەوە. و بە جۆرێکی تایبەتی هەڵدەســـتن بە توێژینەوە

لە هۆکارەکانی ئەم جیاوازیدانانە بۆ راسـپاردن و پێشنیار کردنی گونجاو و کاریگەر بۆ قەڵاچۆ کردن و لە ناوبردنی.

مادەدەی ١١

هەمـوو دەوڵەتێـک هەڵدەسـتێ بـە بەهێزکردنـی رێزگرتن و رەچاوکردنـی مافەکانی مـرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییـەکان بە پێی بەڵگەنامەی نێودەوڵەتی و هەڵدەسـتێ بە پابەندبوونێکی تەواو وردی حوکمەکانی ئەم جاڕنامەیـەو جاڕنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ و جاڕنامەی بەخشـینی سـەربەخۆیی بـە وڵاتان و گەلانی کۆلۆنیکراو.

## جاڕنامە سەبارەت بە مافی
# گەلان لە ئاشتی

**بە پێی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ژمارە ٣٩/١١ لە مێژووی ١٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٨٤ بڕیاردراوەو بڵاوکراوەتەوە.**

کۆمەڵەی گشتی؛

دووبارە تەئکید دەکاتەوە کە ئامانجی سەرەکی نەتەوەیەکگرتووەکان بریتییە لە پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی،

و پرەنسیپە بنەڕەتییەکانی قانوونی نێودەوڵەتی کە لە بەڵگەنامەی نێودەوڵەتیی دا هاتووە جێگای بایەخ پێدانییەتی و ئارەزوو و ئاواتی گشت گەلان لە سڕینەوەی جەنگ لە ژیانی رەگەزی مرۆڤایەتی رادەگەیەنێ و بەر لە هەر شتێک، خۆلادان لە روودانی کارەساتێکی ئەتۆمیی لە سەر ئاستی جیهانیی و لەو قەناعەتەوە کە ژیان بە بێ جەنگ ئەوا وەکو مەرجێکی بنەڕەتیی نێودەوڵەتی وایە بۆ خۆشگوزەرانیی ماددی وڵاتان و هەروەها گەشەپێدان و پێشکەوتنیان و بۆ جێبەجێ کردنی تەواوی هەموو مافەکان و ئازادییە بنەڕەتییەکان کە نەتەوەیەکگرتووەکان بانگەوازی بۆ دەکا و پەی بەوە دەبا کە بەرپاکردنی ئاشتی بەردەوام لە سەر زەوی، لە سەدەی ئەتۆمیدا، مەرجی یەکەمی پاراستنی شارستانێتی مرۆڤایەتی و مانەوەی ڕەگەزی مرۆڤەو باوەڕی وایە کە زامن کردنی ژیانێکی ئارام بۆ گەلان ئەرکێکی پیرۆزیان هەموو دەوڵەتێکە،

١. بە رەسمی رایدەگەیەنێ کە گەلانی سەر ئەم هەسارەیەمان مافێکی پیرۆزی لە ئاشتیدا هەیە.

٢. بە رەسمی رایدەگەیەنێ کە پاراستنی مافی گەلان لە ئاشتیدا و هاندانی جێبەجێکردنی ئەم مافە، هەردووکیان پابەندییەکی بنەڕەتی بۆ هەر دەوڵەتێک پێکدێنێ.

٣. تەئکیـــد دەکاتەوە کـــە زامنکردنی پرۆڤە کردنـــی مافی گەلان لە ئاشـــتیدا داوا لـــە دەوڵەتان دەکا کە سیاســـەتەکانی خۆیان بە ئاراســـتەیەکدا ببەن کە مەترســـییەکانی جەنگ لـــە نێوبەرن. بەر لە هەر شـــتێکیش جەنگی ئەتۆمی و وەلاوەنانـــی بەکارهێنانی هێز لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا و بەلا داخســـتنی کێشـــەو بەرەی نێودەوڵەتی بەرێوشوێنی ئاشتییانە لە سەر بنەمای بەڵگەنامەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان.

٤. بانگەوازی گشـــت دەوڵەتان و رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان دەکا کە هەرچی لە توانایاندا هەیە بیخەنەگەڕ بۆ یارمەتیدانی زامنکردنی جێبەجێکردنی مافی گەلان لە ئاشتیدا لە ڕێگای وەرگرتنی ڕێوشوێنی گونجاو لە سەر هەردوو ئاستی نیشتیمانی و نێودەوڵەتی.

**راگەیاندنی بەخشینی سەربەخۆیی بە وڵاتان و گەلانی کۆلۆنیکراو بە پێی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ١٥١٤ (د– ١٥) لە مێژووی ١٤ی کانونی یەکەمی ١٩٦٠ بە فەرمیکراوە و بڵاوکراوەتەوە.**

کۆمەڵەی گشتی؛

ئەمە وەبیر دەهێنیتەوە کە پێشـــتر گەلانی جیهان لە پەیماننامەی نێودەوڵەتیدا بڕیاری خۆی لە سەر ئەوە ساخ کردۆتەوە کە دووبارە ئیمانی خۆی بە مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ، یەکســـانیی مافەکانی پیاوان و ژنان و یەکســـانیی نەتەوە گەورە و بچووکەکان، هەروەها پێشـــکەوتنی کۆمەڵایەتی بە هێز بکا و ئاستەکانی ژیان لە کەش و هەوای ئازادییەکی بەربەرین تردا باشـــتر بکا و پەی بە پێویســـتیی هێنانەکایـــەی کۆمەڵـــە هـــەل و مەرجێک دەبا کە ســـەقامگیریی و خۆشگوزەرانیی دامەزراندنی پەیوەندیگەلی ئاشتییانە و دۆستانە لە سەر بنەمای ڕێزگرتن لەپرنســـیپەکانی یەکسانیی هەموو گەلان لە مافەکانیـــان و لە بڕیاردانی چارەنووســـی هەر گەلێک و، ڕێزگرتن و ڕەچاوکردنی تـــەواوی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکانی هەمـــوو خەڵک بێ جیاوازیدانان بە هۆی نەژاد یان ڕەگەز یان زمان یان ئایین. هەروەها پەی بەو تاسە وئارەزووە بە هێزە کە لە هەموو گەلانی پاشـــکۆدا بۆ ئازادی و ئەو ڕۆڵە یەکلایکەرەوەیە دەبا کە ئەم گەلانە بۆ وەرگرتنی سەربەخۆیی خۆیان دەیگێڕن.

کۆمەڵەی گشتی لە هەمبەر ئاڵۆزبوونی ئەو کێشەوبەرانەی کە لە ئەنجامی نکوولیی کردن لە ئازادیی ئەو گەلانە یا خوود لە بەربەست دانان لە ڕێگای ئازادیی گەلان کە هەڕەشـــەیەکی ترسناک بۆ ئاشتی جیهانی پێکدەهێنـــێ، بەرچاوڕوونی هەیە و بـــە چاوی بایەخەوە لـــەو ڕۆڵە گرنگەی نەتەوەیەکگرتـــووەکان دەڕوانێ لە یارمەتیدانی

جووڵانەوەیـــەک کە ئامانجی ســـەربەخۆییە لـــەو هەرێمانەی کە لە ژێـــر (وصایە) دان هەروەها لەو هەرێمانـــەش کە لە ئوتۆنۆمی بەهرەمەندنین.

هەروەها پەی بەو ئـــارەزووە بەهێزە دەبا کە لە گەلانی جیهان دا هەیە بۆ کۆتایی هێنان بە کۆلۆنیالیزم بە هەموو شـــێوەکانییەوە و بە قەناعەتەوە ئەوە دەبینێ کە بەردەوامبوونی کۆلۆنیالیزم کۆسپ دەخاتە بەردەم هاوکاری نێودەوڵەتیی ئابووری و ڕێگا لە گەشـــەی کۆمەڵایەتی وکولتووری و ئابوریی گەلانی پاشکۆ دەگرێ، کە لەگەڵ ئەو ئاشـــتییە جیهانییەدا ناکۆکە کە نەتەوەیەکگرتووەکان هەوڵی بۆ دەداو گـــەلان، بۆ هێنانە دی ئامانجـــە تایبەتییەکانی خۆیان، بۆیان هەیە بە ئازادییەوە سامان و سەرچاوەی داهاتەکانیان بە کار بهێنن بێ ئەوەی کەلوکەمییەک بخاتە ناو ئەو پابەندییانەوە کە لە هاوکاری نێودەوڵەتیی ئابوریی کە لە ســـەر پرەنسیپی بەرژەوەندی هاوبەش و هەروەها لـــە قانوونی نێودەوڵەتییەوە ســـەرچاوەیان گرتووەو لەو باوەڕەدایە کە ناتوانرێ بەربەرەکانی پرۆسەی رزگاری بکرێ یا خوود لە ناوببرێ و ئینجا بۆ دوورکەوتنەوە لە قەیرانگەلی ترســـناک، کارێکی حەتمییە دەبێ ڕادەیەک بۆ کۆلۆنیالیزم و گشت شێوازەکانی جیاوازی و هەڵاواردن کە لێیەوە هاتوون دابنرێ و بەوە خۆشحاڵە کە ژمارەیەکی گەورە لە هەرێمە پاشکۆکان لەم ساڵانەی دواییدا ئازادی و سەربەخۆییان وەرگرتووەو پەی بەو ئاراستانە دەبا کە بە گەرموگوڕییەوە بە هێز دەبن لە ناو ئەو هەرێمانەدا کە هێشتا ســـەر بە خۆییان وەرنەگرتووەو ئیمانی بەوەیـــە کە هەموو گەلان مافێکـــی جێگیریان لە ئازادی تەواو و لە بەکارهێنانی ســـەروەریی و پاراستنی خاکی نیشـــتمانییدا هەیە و بەرەسمیی ڕایدەگەیەنێ کە دەبێ بـــە خێرایی و بێ هیچ مەرجێک، رادەیەک بۆ کۆلۆنیالیزم بە هەموو وێنەو رواڵەتەکانییەوە دابنرێ، بۆ ئەم مەبەستەش، ئەمەی

خوارەوە ڕادەگەیەنێ:

١- ملکەچکردنی گەلان بۆ بە کۆیلەکردنی بیانیی و خۆبەسەرداسەپاندنی و چەوساندنەوەی، نکوڵیی کردن لە مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ پێکدەهێنێ و لەگەڵ پەیماننامەی نەتەوەیەکگرتووەکان ناکۆکەو بەربەست دەخاتە بەردەم دۆزی ئاشتی و هاوکاریی جیهانی.

٢- هەموو گەلان مافی بڕیاردانی چارەنووسی خۆیان هەیە، بە پێی ئەم مافەش بۆی هەیە پێگەی سیاسی خۆی ئازادانە دیاری بکا و ئازادانە هەوڵ بۆ گەشەی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و کولتووریی خۆی بدا.

٣- هەرگیز ناشێ کەموکوڕیی لە مەیدانی سیاسی یان ئابوری یان کۆمەڵایەتی یان پەروەردەیی بکرێتە بیانوویەک بۆ دواخستنی سەربەخۆیی.

٤- سنوور بۆ هەموو جۆرە کردارە چەکدارییەکان وڕێ شوێنەکانی پاکتاوکاری، کە دژی گەلانی پاشکو ئاراستە دەکرێ، دادەنرێ، بۆ ئەوەی بتوانێ بە جۆرێکی ئازادانە و ئاشتییانە مافی خۆی لە سەربەخۆیی تەواو بە کار بهێنێ و، هەروەها ڕێز لە یەکپارچەیی خاکی نیشتمانەکەی دەگیرێ.

٥- دەسبەجێ ڕێ و شوێنی پێویست وەردەگیرێ بۆ ئەوەی لەو هەرێمانەی کە لە ژێر (وصایە) دان یاخوود لەو هەرێمانەی کە لە ئوتۆنۆمی بەهرەمەند نین، یا خوود هەموو ئەو هەرێمانەی کە هێشتا سەربەخۆیی خۆیان وەرنەگرتووە، هەموو دەسەڵاتەکان بۆ گەلانی ئەو هەرێمانە بگوازرێتەوە بێ هیچ چەشنە مەرجێک یان خۆپارێزییەک بە پێی ئیرادە و ئارەزووی خۆی کە ئازادانە گوزاشتی لێبکا، بێ جیاوازیدانان بە هۆی نەژاد، باوەڕیان ڕەنگ بۆ ئەوەی بتوانێ لە سەربەخۆیی و ئازادی تەواو بەهرەمەند بێ.

٦– هەر چەشنە هەوڵێک کە ئامانجی ئەوە بێ بە جۆرێکی پاژەکی یان گشتەکی یەکێتی یان یەکپارچەیی هەرێمیی وڵاتێک هەڵبتەکێنێ، ئەوا لەگەڵ ئامانجەکان و پرەنســیپەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان دا نالێک دەبێ.

٧– هەموو دەوڵەتەکان بە دەسپاکی و ووردییەوە بە ئەحکامەکانی پەیماننامەی نەتەوەیەکگرتووەکان و جاڕنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ و ئەم ڕاگەیەنراوەوە پابەند دەبێت لەسەر بنەمای یەکسانیی و دەستێوەرنەدان لە کاروباری ناوخۆیی هەموو دەوڵەتان و ڕێزگرتنی مافەکانی سەروەریی و یەکپارچەیی هەرێمیی هەموو گەلان.

## پرۆژەی پرەنسیپە گشتییەکان

### دەربارەی ئازادی و جیاوازیدانەنان لە پرسی مافە سیاسییەکاندا

### دیباچە

لە وەڕا کە گەلانی جیهان لــە بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان دا ئیمانی خۆیـــان بە مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ و کەرامەتی مرۆڤ و یەکســانیی مافەکانــی پیــاوان و ژنان و هەمــوو نەتەوەکان بە گەورە وبچوکیانەوە و بە پاڵپشــتی کردنی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و باشــترکردنی ئاســتەکانی ژیان لە کەشــوهەوایەکی لەبارتری ئازادیدا دووبارە تەئکید دەکەنــەوە. لە وەڕا کە بەڵگەنامەکە وەکو ئامانجێک لــە ئامانجەکانی نەتەوەیەکگرتــووەکان و بە هێزکردن و هاندانــی ڕێزگرتن لە مافەکانی مــرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان بۆ هەموان بێ جیاوازیدانان لەســەر بنەمــای نەژاد یان رەگەز یان زمــان ئایین؛ لــە وەڕا کە جاڕنامــەی جیهانیــی مافەکانی مرۆڤ بەرفراوانکردنــی پرەنســیپی جیاوازیدانەنــان پرەپێــدەدا، ئەوا رادەگەیەنێ رادەگەیەنێ کە هەموو مرۆڤێک مافی بەهرەمەند بوونی لــە هەموو مافــەکان و ئەو ئازادییانەدا هەیە کــە لە جاڕنامەکەدا هاتــوون، بێ هیچ جۆرێک جیاوازیی لــە نێوان جۆرەکاندا وێرا بە هۆکاری رای سیاسیشــەوە و لە دەقێکــدا گونجاندوویەتی کە نابێ لەسەر بنەمای هەلومەرجی سیاسی یان قانونیی یان نێودەوڵەتیی وڵاتەکە یان هەرێمەکەکە ئەو کەســە تێیدا دەژی، جیاوازیی دابنرێ و لەوەڕا کە بەرژەوندییەکانی زۆرێک لە کەســەکان، لەو کاتەدا کە دەسەڵاتی سیاسی دەکەوێتە ناو دەستی کەمینەوە، پشتگوێدەخرێ، مافی هەموو مرۆڤێک لە بەشداریی کردن لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتەکەیــدا مەرجێکە کــە قەرەبووکردنەوەی بــۆ نییە، بۆ ئەوەی هەمووان بە شێوەیەکی کردەوەیی لە گشت مافەکانی مرۆڤ، بە مافە ئابــووری و کۆمەڵایەتیی و کولتووریەکانیشــەوە بەهرەمەند بن و

لەوەڕا کە پراکتیک کردنی مافە سیاسیەکان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەســـتە بە بوونی ئازادیی ڕادەربڕین و گوزارشتکردن و ئازادیی کۆ بوونەوەی ئاشتیانەو پێکهێنانی کۆڕوکۆمەڵە؛ و لەوەڕا کە ناکرێ ئەم مافانە بە شێوەیەکی کاریگەرانە زامن بکرێن تەنیا لە جیهانێکدا نەبێ کە بە شێوەیەکی تەواو پرەنسیپەکانی بەڵگەنامەی تێدا پیادە بکرێ، بە جۆرێکی تایبەتیش پرەنســـیپی بڕیاردانی چارەنووس و پرەنسیپەکانی تەرخانکراوی نێو جاڕنامەی بەخشینی سەربەخۆیی بە وڵاتان و گەلانی کۆڵۆنیکراو کە لە بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ١٥١٤ (د- ١٥) لە مێژووی ١٤ی کانونی یەکەمی ١٩٦٠دا هاتووە؛

ئەم پرەنســـیپە گشـــتییانەی خوارەوە بۆ هەمووان رادەگەیەنرێ لە پێناوی دانپێدانان بە مافی هەموو مرۆڤێک لە بەشـــداریکردن لە بەڕێوەبردنـــی کاروباری وڵاتەکەی و هەروەها مافە سیاســـییەکانی دیکەی پەیوەندیـــدار پێیەوە و بۆ قەدەغەکردنـــی جیاوازیدانان لە بەهرەمەند بوون لەم مافانە:

یەکەم: مافی هەموو گەلان لە بڕیاردانی چارەنووس

هەموو گەلان مافی بڕیاردانی چارەنووسی خۆیان هەیە؛ بە پێی ئەم مافەش، گەلان بە ئازادییەوە پێگەی سیاسیی خۆیان دیاریدەکەن و بە ئازادیی سیاسییەوە گەشەپێدانی ئابووری و سیاسیی و کولتوری خۆیان بەرنامەرێژی دەکەن.

دووەم: مافە سیاسییەکانی هاووڵاتییان

١- هەمـــوو هاووڵاتییەک لە هەر وڵاتێکدا بێـــت مافی بەهرەمەند بوونی لە مافە سیاسییەکاندا بە تەواوی و بە یەکسانیی هەیە، بێ هیچ جۆرە جیاوازیدانانێک لەسەر بنەمای نەژاد یان رەنگ یان رەگەز یان زمان یان ئایین یان رای سیاســـیی یان غەیری سیاســـیی، یان

ڕەچەڵەکی نیشـــتیمانی یان کۆمەڵایەتی، یان سامان یان ڕەچەڵەک یان هەر وەزعێکی دیکە.

٢- هیچ کەسێک لە ڕەگەزنامە بێبەش ناکرێ و ڕەگەزنامە لە هیچ کەسێک ناسەنرێتەوە وەکو ئامرازێک بۆ بێبەشکردنی یان داماڵینی لە مافە سیاسییەکانی.

٣- مەرجەکانـــی تەمـــەن و درێژیی مـــاوەی مانـــەوەو هیتریش جگەلەمانـــە، ماوەی نیشـــتەجێبوون و لەو مەرجانـــەن کە قانون دایدەڕێـــژێ بـــۆ پراکتیک کردنی هـــەر مافێکی دیاریکـــراو لە مافە سیاسییەکان بە هەمان مەرج بۆ هەموو هاووڵاتییانی هەر وڵاتێک یان دانیشتوانی یەکەیەکی سیاسی بە گوێرەی پێداویستی حاڵەتەکە.

## سێیەم: ئازادیی ڕا و پێکهێنانی کۆمەڵە

ئازادیی ڕاو گوزارشـــتکردن و ئازادیی کۆ بوونەوەی ئاشـــتییانە و پێکهێنانـــی کۆمەڵـــە دوو بنەمـــان بۆ بەهرەمەند بـــوون لە مافە سیاسییەکان، ئەم دوو ئازادییە و هەروەها دەرەتانی دەستگەیشتن بە ئاسانکاریی و ڕێگاکانی پراکتیک کردنیان بۆ هەموو کەسەکان لە هەموو کاتەکاندا.

## چوارەم: گشتیبوونی دەنگدان

هەمـــوو هاووڵاتییـــەک مافی دەنگدانـــی لە هـــەر هەڵبژاردنێکی نیشـــتیمانیی یان هەر ڕاپرســـییەکی میللی یان ڕاپرسییەکی گشتیدا هەیە کە لە وڵاتەکەیدا بەڕێوەدەچێ و مافی لە ڕا وەرگرتنی گشتیدا هەیە لەو یەکە سیاســـییە یـــان کارگێڕییە کە تێیدا نیشـــتەجێیە. پێویســـتە مافی دەنگدان لەســـەر ئەوە ڕانەوەستێ کە خوێندنەوە و نووســـین یان لەســـەر هەر لێهاتووییەکی دیکەی فێرکاریی قەتیس نەکرێ.

پێنجەم: یەکسانیی لە دەنگدانی گشتی

١- هەموو هاووڵاتییەک مافی دەنگدانی لەهەر هەڵبژاردنێکدا هەیە و لەهەر راوەرگرتنێکی دیکەی گشـــتیدا کە شـــایان بێت بۆی، مافی دەنگدانی بە مەرجی یەکسان هەیە و هەر دەنگێک لە دەنگەکان هەمان قورساییان هەیە؛

٢- کاتێـــک دەنگـــدان لەســـەر بنەمـــای بازنەکانـــی هەڵبژاردن بەڕێوەدەچێ، بازنەکانی هەڵبژاردن لەسەر بنەمایەکی دادپەروەرانە دیاریدەکرێ بە جۆرێک کە ئەنجامەکان بە جۆرێکی ورد و گشـــتگیر ئیرادەی گشت دەنگدەران بەرجەستە بکاتەوە؛

٣- ســـەبارەت بە هەر هەڵبژاردنێک یان هەر راوەرگرتنێکی گستی بە دەنگدانی ناراســـتەوخۆ بە ڕێوەدەچێ لستێکی گشتیی هەڵبژاردن دادەنرێ ناوی هەر هاووڵاتییەکی تێدا دەنوسرێ کەشیاوی هەیە.

شەشەم: نهێنیبوونی دەنگدان

١- پێویســـتە هەمـــوو دەنگدەرێک دەرەتانی ئـــەوەی هەبێ کە بە ڕێگەیەک دەنگی خۆی بدات کە بواری ئەوەی تێدا نەبێ کە چۆنیەتی دەنگدانەکەی یاخوود بەوجۆرەی کە دەیەوێ دەنگبدات ئاشکرا بکات؛

٢- لە کاتی بەجێهێنانی هەر چەشـــنە ڕێوشـــوێنێکی قانونی یان هەرجۆرە ڕێوشوێنێکی دیکەدا، هیچ دەنگدەرێک ناچار ناکرێ باسی چۆنیەتی دەنگدانەکەی خۆی یان ئەو شـــێوەیە کە دەیەوێ دەنگبدات باس بـــکات، هەروەها نابێ هیچ کەســـێک هەوڵی ئـــەوە بدات کە زانیاریی لەبارەی دەنگدان یان ئـــەو ڕێگەیە کە دەیەوێ دەنگبدات، چ بە ڕاستەوخۆ یان بە ناڕاستەوخۆ، لە هیچ کەسێکەوەوەربگرێ.

حەوتەم: دەورەیی بوونی هەڵبژاردنەکان

هەڵبژاردن بۆ هەموو پلەوپایە گشتییەکان کە ملکەچی هەڵبژاردنە

لە دەورەی زەمەنیی مەعقولدا بەڕێوەدەچێ، ئەمەش بە مەبەستی دابینکردنی ئەوەی کە ئیرادەی گەل لە هەموو کاتەکاندا بنەمای دەسەڵاتی فەرمانڕەواییە.

هەشتەم: سروشتی بێگەردیی لە هەڵبژاردنەکان و راوەرگرتنە گشتییەکانی دیکەدا

١- هەر دەنگدەرێک ئازادە لە دەنگدان بۆ ئەو پاڵێوراوەی کە خۆی پەسندی دەکا یان بە لیستی ئەو پاڵێوراوانە کە پەسندی دەکا لە هەر هەڵبژاردنێک بۆ پلەیەکی گشتی و ناچار ناکرێ دەنگ بە پاڵێوراوێکی دیاریکراو یان لیستێکی دیاریکراوی پاڵێوراوان بدات؛

٢- هەموو دەنگدەرێک ئازادە لە دەنگدان بۆ بەرژەوەندی یان دژی هەر پێشنیارێک کە دەخرێتە راپرسیی گشتی یان راپرسیی میللییەوە یان هەر جۆرە راوەرگرتنێکی دیکەی گشتی؛

٣- بەرێوەبردنی هەڵبژاردنەکان و راوەرگرتنە گشتییەکانی دیکەش وێرا بە ئامادەکردنی لیستی هەڵبژاردنەکانیشەوە پێداچوونەوەی دەوریی هەڵبژاردنەکان، لە لایەن دەسەڵاتگەلێکەوە سەرپەرشتی دەکرێ کە سەربەخۆیی و بێگەردیی بەرێوەچوونی هەڵبژاردن زامن دەکا و بڕیارەکانیشی لەبەردەم دەسەڵاتە دادوەرییەکاندا یان کۆمیتە سەربەخۆ و بێگەردەکان شیانی تانەلێدانی هەیە؛

٤- پێویستە ئازادییەکی تەواو بۆ گوزارشتکردنێکی ئاشتیانە لە ئۆپۆزیسیونی سیاسی و هەروەها رێکخستن و ئازادیی کاری پارتە سیاسییەکان دابینبکرێ وێرای دابینکردنی مافی پێشکەشکردنی پاڵێوراوان بۆ هەڵبژاردن.

نۆیەم: وەرگرتنی پۆستی گشتی

١- هەموو هاووڵاتییەک بە پێی مەرجگەلێکی یەکسان شیانی

ئەوەی هەیە خۆی بۆ هەر پۆســـتێکی گشـــتی کە ملکەچی هەڵبژاردن بێـــت، بپاڵێوێ لە نێو وڵاتەکەیدا لە هەر یەکەیەکی سیاســـیی یان کارگێڕیدا کە ئەو تێیدا بێت؛

٢- رادەی جێبەجێبوونی ئەم پرەنسیپە بەسەر ئەوانەی کەلەوانەیە هەڵبژاردنیان ببێتە هۆی کێشەو ناکۆکیی لە نێوان ئەرکەکانیان یان بەرژەوەندییە کەســـییەکانیان لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ســـەرجەم کۆمەڵگادا، لە لایەن قانونەوە دیاریدەکرێ.

دەیەم: وەرگرتنی پۆستی گشتی کە ملکەچی هەڵبژاردن نییە

(١) هەموو هاووڵاتییەک، بە مەرجگەلی یەکسان، بۆی هەیە هەر پۆســـتێکی گشتی کە ملکەچی هەڵبژاردن نییە لە وڵاتەکەیدا یان هەر یەکەیەکی سیاسیی یان کارگێڕیی کە تێیدایە وەربگرێ.

(ب) رادەی جێبەجێبوونـــی ئەم پرەنســـیپە بەســـەر ئەوانەی کە دیاریکردنیان یان ناودێرکردنیان بۆ پۆســـتێکی گشـــتی کە ملکەچی هەڵبـــژاردن نیە، کـــە لەوانەیە ببێتـــە هۆی کێشـــە و ناکۆکی لە نێـــوان ئەرکەکانیـــان یـــان بەرژەوەندییە کەســـییەکانیان لەگەڵ بەرژەوەندییەکانـــی ســـەرجەم کۆمەڵـــگا، لـــە لایـــەن قانونەوە دیاریدەکرێ.

(ج) هەموو دیاریکردنەکان بۆ خزمەتی وەزیفەی شارستانیی لەهەر وڵاتێکدا لەسەر بنەمایەکی بابەتیی و بێگەرد دەبێت.

یازدەیەم: ئەو ڕێوشـــوێنانەی کە پێویســـتە بـــە جیاوازیدانان دانەنرێن

پێویســـتە ئەم رێوشوێنانەی خوارەوە کە بە دەقێکی قانونیی یان نیزامی نوسراون بە جیاوازیگەریی دانەنرێن:

(١) مەرجـــی ماقووڵ بـــۆ پراکتیکردنی مافی دەنگـــدان یان مافی

وەرگرتنی پۆستی گشتی کە ملکەچی هەڵبژاردن نیە؛
(ب) لێهاتوویی ماقوول بۆ دیاریکردنی وەرگرتنی پۆستێکی گشتی، کە لە سرووشتی ئەرکەکانی ئەو پۆستەوە هاتووە؛
(ج) ئەو ڕێوشوێنانەی کە ماوەیەکی زەمەنیی ماقووڵ دیاریدەکا، هەردەبێ تێبپەڕێ بەرلەوەی بوار بداتە ئەو کەسانە کە ڕەگەزنامەیان وەرگرتووە بۆ پراکتیک کردنی مافە سیاسییەکانیان؛
(د) ڕێوشوێنی تایبەتی بۆ دابینکردنی ئەمەی خوارەوە
١- نۆینەرایەتییەکی گونجاو بۆ پاژێک لە دانیشتوانی وڵاتێک کە لە ڕاستیدا هەلومەرجی سیاسی یان ئابووری یان ئایینی یان کۆمەڵایەتی یان مێژوویی یان کولتووریی ڕێگا لە تاکەکانی دەگرێ کە لەگەڵ باقی دانیشتواندا لە پرسی مافە سیاسییەکاندا یەکسان بن؛
٢- نوێنەرایەتییەکی هاوسەنگ بۆ گشت ڕەگەزەکانی کە دانیشتووانی وڵاتێک پێکدەهێنن،
ئەمە بەومەرجەی کە ئەم ڕێوشوێنانە بەردەوام نەبێ تەنیا لە حاڵێکدا کە پێویستییەک هەبێ بۆیان، تەنیا بە ئەندازەی پێویستیی بوونیان.

دوازدەیەم: کۆتوبەندەکان

ئەم ماف و ئازادییانەی کە لەسەرەوە ڕاگەیەنراون بە هیچ حاڵێک لە حاڵەتەکان وەها پراکتیک ناکرێن کە لەگەڵ ئامانج و پرەنسیپەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان دا نالێک بن و تەنیا ملکەچی ئەو کۆتوبەندانە دەبن کە قانون دیاریاندەکا بۆ مەبەستی دابینکردنی کاری پێویست بۆ دانپێدانان بە مافەکان و ئازادیی کەسانیتر و ڕێزگرتنی ئەم مافانە و بە مەبەستی پابەندبوون بە پێداویستییەکانی سیستەمی گشتی و پرەنسیپە ئاکارییەکان و خۆشگوزەرانیی گشتیی لە کۆمەڵگایەکی

دیموکراســیدا. و هەر کۆتوبەندێک بســەپێنرێ پێویســتە لەگەڵ ئامانجەکان و پرەنسیپەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان دا یەکبگرێتەوە.

**سێزدەیەم: گرەنتیی دەستووریی**

دەکرێ بــۆ زامنکردنی ئەم مــاف و ئازادییانەی کە لە ســەرەوە راگەیەنراون بە پەســندترین شــێوە لە نێو دەســتوور یان قانونە بنەڕەتییەکاندا بەرجەســتە بکرێن لەوانەی کــە نابێ هیچ کام لەو دەســتوور یان قانونــە بنەڕەتییانە لە ڕێگای قانــون دەرکردنێکی ئاساییەوە هەڵبوەشرێنەوە یا خوود هەموار بکرێن.

**چواردەیەم: پەنا بردن بۆ دادگا سەربەخۆکان**

هەرجۆرە بێبەشــبوونێک لــەم ماف و ئازادییانــە یا خوود هەر چەشنە پێشــێلکردنێکیان مافی پەنا بردن بە کەسی زوڵملێکراو یان کە کەســانی زوڵملێکراو دەبەخشێ بۆ ســکاڵا بردنە بەردادگایەکی سەربەخۆ و بێگەرد.

**پازدەیەم: پیادەکردنی پرەنسیپەکان**

ئەم پرەنسیپانە بەسەر هەموو وڵاتانی سەربەخۆ و هەروەها ئەو وڵاتانەشدا پیادە دەکرێن کە ملکەچی دەسەڵاتی بیانین.

**جاڕنامە دەربارەی لەناوبردنــی هەموو جۆرەکانی دەمارگیریی و جیاوازیگەریی کە لەسەر بنەمای ئایین یان باوەڕدامەزرابێ. بە پێی بڕیاری کۆمەڵە گشــتی نەتەوە یەکگرتووەکان ژمارە ٢٧/٥٥ لە ٢٥ تشرینی دووەمی ١٩٨١ دەرچووە و بڵاوکراوەتەوە.**

کۆمەڵەی گشتی؛

بە بایەخـــەوە دەڕوانێنـــەوە ئەوەی کـــە یەکێک لە پرەنســـیپە بنەڕەتییەکانــی بەڵگەنامــەی نەتەوەیەکگرتـــووەکان بریتییە لە پرەنســـیپی کەرامەت و یەکســـانیی رەســـەنی هەموو مرۆڤەکان و هەموو دەوڵەتانــی ئەندام پەیمانیان داوە کە بـــە هاوکاری لەگەڵ رێکخراوەکـــەدا، رێوشـــوێنی هاوبـــەش و ســـەربەخۆ وەربگرن بە مەبەســـتی بە هێزکردن و هاندانـــی رێزگرتنێکی جیهانیی و کاریگەر لـــە مافەکانی مـــرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان بـــۆ هەمووان، بێ جیاوازیدانـــان بە هۆی نەژاد یان رەگەز یـــان زمان یان ئایین و بە بایەخەوە دەڕوانێتە ئەوەی کە جاڕنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ و هـــەردوو پەیماننامەی نێودەوڵەتیی تایبـــەت بە مافەکانی مرۆڤ بانگەوازی پرەنســـیپەکانی جیاوازیدانەنان و یەکســـانیی لەبەردەم قانـــون و مافی ئازادیی بیرکردنەوە و ویـــژدان و ئایین باوەڕ دەکا و بە بایەخەوە دەڕوانێتە ئەوە کە پێشتگۆیخســـتن و پێشـــێلکردنی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان، بە تایبەت مافی ئازادیی بیرکردنەوە یان ویـــژدان یان ئایین یان باوەڕ جا هەر چییەک بێ، چ بە راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ، کۆمەڵە جەنگێک و ئازارگەلێکی گەورەیـــان بۆ مرۆڤایەتی هێنا، بە تایبەتیش ئەمانە هۆکارێکن بۆ دەســـتێوەردانی دەرەکی لە کاروباری نێوخۆیی وەوڵەتانی دیکەدا و دەبنە مایەی وروژاندنی ڕقوکینە لـــە نێوان گەلان و نەتەوەکاندا و بە بایەخەوە دەڕوانێتە ئەوە کە ئایین یان باوەڕ، بۆ هەر کەســـێک

که ئیمانی پێیەتی، یەکێکە لە رەگەزە بنچینەییەکانی ئەو کەسە لە لێڕوانینیدا بۆ ژیان، بۆیە ئەمە بە ئەرکێک دادەنرێ کە رێزی ئازادیی ئایین و باوەڕ بگیرێ و بە شێوەیەکی تەواو زامنبکرێ و بە بایەخەوە دەڕوانێتــە ئەوە کە پەرەپێدانی لە یەکتر گەیشــتن و لێبووردەیی و رێزگرتن لە کاروباری پەیوەست بە ئازادیی ئایین و باوەڕ، کارێکی گەوهەرییە و دەستەبەرکردنی رێگەنەدان بە بەکارهێنانی ئایین یان باوەڕ بۆ ئامانجگەلێک کە لەگەڵ بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان و قەباڵەکانی دیکەی پەیوەست بەم بابەتە و ئامانج و پرەنسیپەکانی ئــەم جاڕنامەیە و ئیمانــی بەوە هەیە کە ئازادیــی ئایین و باوەڕ پێویســتە لە هێنانەدی ئامانجەکانی ئاشتی جیهانیی و دادپەروەری کۆمەڵایەتی و دۆســتایەتیی نێوان گەلان و هەروەها لە لەناوبردنی ئایدلۆژیا و کاروکردەوە گەلی ئیستیعمار و جیاوازیدانانی رەگەزیدا، بەشداری بکا و بە خۆشــحاڵییەوە ئەوە تۆمار دەکا کە تاکو ئێستا چەندیــن رێککەوتننامە بڕیاری لەســەر دراوە، هێندێک لەمانە لە ژێر چاودێریی نەتەوەیەکگرتووەکان و ئاژانسە تایبەتییەکاندا، بۆ لە ناوبردنی چەندین شــێوە لە جیاوازیدانان، کەوتەوونەتە واری جێبەجێکردنەوە و نیگەرانیی خۆی دەردەبڕێ لەهەمبەر رواڵەتەکانی دەمارگیریــی و بوونی جیاوازیدانان لە کاروباری ئایین یان باوەڕ، کە هێشــتاکە لە هێندێک ناوچەی جیهاندا بەدیدەکرێ و لەوەڕا کە بڕیاریداوە گشت رێوشوێنێکی پێویست وەربگرێ بۆ ئەوەی بە پەلە ئەم جۆرە دەمارگیرییە بە هەموو شێوە و جۆرەکانیەوە لە ناوبەرێ و بەرهەڵســتیی و قەڵاچۆی جیاوازیدانان لەسەر بنەمای ئایین یان باوەڕ بکا، ئەم جاڕنامەیە دەربارەی لە ناوبردنی هەموو شێوەکانی دەمارگیریی و جیاوازیدانان کە لەســەر بنەمــای ئایین یان باوەڕ دامەزرابێ رادەگەیەنێ:

## مادەی ١

١- هەموو مرۆڤێـــک مافی ئازادیی بیرکردنەوە و ویژدان و ئایینی هەیـــە، ئەم مافەش ئازادیی ئیمان هێنـــان بەهەر ئایین و باوەڕێک کە خـــۆی هەڵیدەبژێرێ و مافی دەرخســـتنی ئایین یان باوەڕەکەی دەگرێتەوە لە ڕێگەی خوداپەرستیی و بە جێهێنانی داب و نەریتەکان و پراکتیـــک کردن و فێرکردنەوە جا بە تەنیا بێت یان بە کۆمەڵ، بە نهێنی بێت یان بە ئاشکرایی.

٢- نابێ هیچ کەســـێک بخرێتە ژێر گوشـــارێکەوە کە ســـنوور لە بـــەردەم ئازادییەکەیدا دابنێ کە ئایین یان باوەڕێکی هەبێ کە خۆی هەڵیبژاردووە.

٣- نابێ مرۆڤ ملکەچ بکرێ کە ئایین یان باوەڕی خۆی دیاربخات، تەنیا لەو حاڵەتەدا نەبێ کە قانون چەند ســـنوورێکی بۆ دادەنێ کە پێویستن بۆ پاراستنی ئاسایشی گشتی یان نیزامی گشتی یان ماف و ئازادییە بنەڕەتییەکانی کەسانیتر.

## مادەی ٢

١- نابێ هیچ کەســـێک بە هۆی ئایین یان باوەڕەوە، ڕووبەڕووی جیاوازیدانان ببێتەوە لە لایەن هەر دەوڵەتێک یان دامەزراوەیەکەوە یان کۆمەڵە کەسێکەوە یان تاکە کەسێکەوە.

٢- لـــە زاراوەی نێو ئـــەم جاڕنامەیەدا برگـــەی (دەمارگیریی و جیاوازیدانان لەســـەر بنەمای ئایین یان بـــاوەڕ) مانای هەرجۆرە جیاکارییەک یان هەڵاواردن یان کوتوبەند یان پەســـندان لەســـەر بنەمـــای ئایین یان باوەڕ، دەگەیەنێ کـــە ئامانجی یان ئاکامەکەی پەکخســـتنی یان کەمکردنەوە لە دانپێدانان بـــە مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان یان بەهرەمەند بوونیان یان پراکتیک کردنیان لەسەر بنەمایەکی یەکسان.

### مادەی ٣

جیاوازیدانـــان لە نێوان مرۆڤەکان لەســـەر بنەمـــای ئایین یان باوەڕ ســـووکایەتیکردنە بە کەرامەتی مرۆڤایەتی و نکوولێکردنە لە بڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان، پێویستە ریسوا بکرێت ئەمەش بەو پێودانەی کە پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکانە کـــە جاڕنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ بانگەوازی بۆ کردووە و بە چڕوپڕیش لەهەردوو پەیماننامەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤ دا هاتووە و هەروەها بەو ســـیفەتەش کە ئەم جیاوازیدانانە تەگەرەیە لە بەردەم دامەزرانی پەیوەندیی دۆســـتایەتی و ئاشـــتیی نێوان نەتەوەکان

### مادەی ٤

١- هەموو دەوڵەتان ڕێوشوێنی کاریگەر وەردەگرن بۆ بەربەستکردن و لە ریشـــە دەرهێنانی هەر جـــۆرە جیاوازیدانانێک بە هۆی ئایین یان باوەڕ، ســـەبارەت بە دانپێدانان بە مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان لە هەموو بوارەکانی ژیانی شارســـتانیی و ئابوری و سیاســـیی و کۆمەڵایەتیی و کولتووریـــی و هەروەها لە بەهرەمەند بوون لەم ماف و ئازادییانە.

٢- هەمـــوو دەوڵەتـــان هەموو کۆششـــێکی خۆیـــان دەخەنە گەڕ بۆ داڕشـــتن یان هەڵوەشـــاندنەوەی قانوونەکان کە پێویســـتن بۆ بەربەســـتکردنی هەر جۆرە جیاوازیدانانێک و بۆ وەرگرتنی گشـــت ڕێوشـــوێنێکی گونجاو بۆ قەڵاچۆکردنی دەمارگیریی لەسەر بنەمای ئایین یان هەر باوەڕگەلێکی دیکەی لەم چەشنە.

### مادەی ٥

١- باوک ودایکی منداڵ یا خوود سەرپەرشـــتیاری شەرعیی منداڵ،

بـــه پێی بوونی حاڵەتەکە، مافی ئەوەیان هەیە کە بەپێی ئایین یان باوەڕی خۆیان ژیانی خۆیان لە نـــاو خێزاندا ڕێکبخەن، بە لەبەر چاوگرتنی ئـــەو پەروەردە ئاکارییەی کـــە باوەڕیان وایە دەبێ ئەو منداڵە لەسەری پەروەردەبکرێ.

٢- هەمـــوو منداڵێـــک مافـــی بەهرەمەندبوونـــی لـــە فێربوونی کاروبـــاری ئایین و باوەڕ هەیە بە پێی ئارەزووی باوک و دایکی یان سەرپەرشـــتیاری شەرعیی، بە پێی بوونی حاڵەتەکە و منداڵ ناچار ناکـــرێ کە ئایین یان باوەڕێکی فێربکرێ کە لەگەڵ ئارەزووی باوک و دایکی یان سەرپەرشـــتیاری شەرعیی منداڵەکە نالێک بێت و دەبێ بەرژەوەندیی منداڵەکە لە پلەی یەکەمدا لەبەرچاو بگیرێ.

٣- پێویستە منداڵ لەهەر چەشنێک لە چەشنەکانی جیاوازیدانان بە هۆکاری ئایین یان باوەڕ، بپارێزرێ و پێویســـتە لەســـەر گیانی لەیەکتر گەیشتن و لێبووردەیی و دۆستایەتیی نێوان گەلان و ئاشتی و برایەتیی جیهانیی و ڕێزگرتنی ئازادیی کەسانیتر لە ئایین و باوەڕ و هەروەها بە هۆشـــیارییەکی تەواو لەمەڕ پێویستیی تەرخانکردنی وزەو بەهرەکانی بـــۆ خزمەتکردنی مرۆڤی بـــرای خۆی، پەروەردە بکرێ.

٤- گەر منداڵ لەژێر سەرپەرشتی باوک ودایکی یان سەرپەرشتیاری شـــەرعیی خۆیدا نەبوو، ئـــەوا لەم حاڵەتەدا پێویســـتە ئارەزووی ڕاگەنراوی ئەو منداڵە، یان هەرشـــتێکی دیکە کە بەڵگە بێت لەسەر ئارەزووی منداڵەکە ســـەبارەت بە پرســـی ئایین یان باوەڕ، لەبەر چاودەگیرێ، بە شـــێوەیەک کـــە بەرژەوەنـــدی منداڵەکە کە پلەی یەکەمدا لەبەر چاودەگیرێ.

٥- پێویستە پراکتیک کردنی ئایین یان باوەڕکان کە منداڵ لەسەری پەروەردە دەکرێ بە جۆرێک بێ کە زیان بە تەندروســـتیی جەستەیی یان ژیریی، یا خوود بە گەشەکردنی تەواوی نەگەیەنێ، ئەمە وێرای

ڕەچاوکردنی بڕگەی ٣ لە مادەی ١ی ئەم جاڕنامەیە.

مادەی ٦

بە پێی مادەی ١ی ئەم جاڕنامەیە و بە پەیوەستیبوون بە بڕگەی ٣ی هەمان مادەی ناوبرا، مافی ئازادیی بیر یان ویژدان یان ئایین یان باوەڕ ئەم ئازادییانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

(١) . ئازادیی پراکتیکردنی خواپەرستی یان گرێدانی کۆبونەوەی پەیوەست بە ئایین یان باوەڕ و دامەزراندن و پاراستنی شوێن بۆ ئەم مەبەستە،

(٢) . ئازادیی دامەزراندن و پاراستنی دامەزراوەی گونجاوی خێرخوازیی یان مرۆڤدۆستی،

(٣) . ئازادیی دروستکردن و بەدەست هێنان و بەکارهێنانی بڕی پێویست لە مادە و کەلوپەلی پێویستی تایبەت بە نەریتەکان و دابەکانی ئایین یان هەر باوەڕێک،

(٤) – ئازادیی نووسین و چاپکردن و دابەشکردنی بڵاوکراوە لەم بوارەدا،

(٥) – ئازادیی فێرکردنی ئایین یان باوەڕ لە شوێنی گونجاو بۆ ئەم مەبەستە،

(٦) – ئازادیی داواکردن و وەرگرتنی پیتاکی ئارەزوومەندانە، چ دارایی بێت یان غەیری دارایی لە کەسان و دامەزراوەکان،

(٧) – ئازادیی پەروەردەکردن یان دانان یان هەڵبژاردن یان دیاریکردنی رابەرانی گونجاو کە پێویستن بۆ داخوازییەکان و پێوەرەکانی هەر ئایین یان باوەڕێک،

(٨) – ئازادیی لەبەرچاوگرتنی رۆژانی پشوودان و ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی جەژنەکان و بەرپاکردنی نەریتەکان بە پێی رێنوینییەکانی ئایین یان باوەڕی ئەو کەسە،

(٩) – ئازادیی دامەزراندن و بەردەوامبوون لە پەیوەندیی کردن بە کەســـان و کۆمەڵەکان لە بارەی کاروباری ئایین یان باوەڕ لەسەر هەردوو ئاستی نەتەوەیی و نێودەوڵەتیی.

مادەی ٧

دەقی ئەو ماف و ئازادییانەی کەلەم جاڕنامەیەدا نوسراون،

لە قانون دارِشـــتنی هەر وڵاتێکدا، بەجۆرێک دەســـتەبەر دەکرێن کە هەر تاکێک لە توانایدا بێت بە شـــێوەیەکی کردەنیی لەم ماف و ئازادییانە بەهرەمەند بێت.

مادەی ٨

هیچ یەکێک لە مادەکانی ئەم جاڕنامەیە ناشـــێ والێکبدرێتەوە کە هیچ مافێکی دیاریکراوی نێو جاڕنامـــەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ و هـــەردوو پەیماننامەی نێودەوڵەتیی تایبـــەت بە مافەکانی مرۆڤ بەرتەسک دەکاتەوە یان لێی کەل دەکات.

